# قەڵای ئاژەڵان



جۆرج ئۆروێل

وەرگێڕانی: عەبدولخالق

اورول، جورج: ۱۹۵۰ـ۱۹۰۳م Orwell, George
**قەڵای ئاژەڵان** / جۆرج ئۆروێل؛ وەرگێڕانی عەبدولخالق تەوەکولی
سقز: گوتار ۱۳۹۵
ISBN: 978-600-7959-48-0
فهرست‌نویسی بر اساس اطلاعات فیپا
موضوع: داستان‌های انگلیسی قرن ۲۰م.
شناسه افزوده: توکلی، عبدالخالق، ۱۳۵۴ ـ مترجم
۱۳۹۵: ۸ق۸۷۳الف/۳ PZ ۸۲۳/۹۱۲
کتابخانه‌ی ملی ایران: ۴۱۹۰۸۶۲


**قەڵای ئاژەڵان**
جۆرج ئۆروێل
وەرگێڕانی عەبدولخالق تەوەکولی
دیزاینی بەرگ و ناوەڕۆک: ئازاد سورخی
ساڵی چاپ: ۱۳۹۵
ئەژمار: ۱۰۰۰ دانە
ناوەندی چاپ و بڵاوکردنەوەی گوتار
سەقز، پاساژی ماد، نهۆمی ۳، یەکەی ۳۲
تەلەفوون: ۳۶۲۲۷۰۳۰ - ۰۸۷

□

# پێڕست

□

## وەرزی ١

ئاغای جۆنز خاوەنی مەزرای مانێر بە ڕادەیەک سەرخۆش بوو کە شەو، کاتێک دەرکەی کولانەکەی داخست لە بیری کرد سەری کلاوڕۆژنەکەی بنێتەوە. لۆژە لۆژ بە یارمەتی ڕووناکی کزی چرا لەنتەرەکەی هەموو حەوشەکە گەڕا، لە پشت دەرکەکەوە پێلاوەکانی داکەند و دوایین پێکی لە بۆشکەی سەر هەیوانەکە پڕ کرد. پەتوکۆ بەرەو هۆدەکەی خۆی ڕێکەوت. بزرکاندن و پرخەپرخی خێزانی تا ڕادەیەک لە نەشەی خست.

به کوژانەوەی ژووری نووستنەکە، جموجۆلێک کەوتە ناو مەزراکەوە. لە ڕۆژدا هەواڵێک کەوتبووە سەر زاران، کە مێجری پیر، ئەو یەکانەی کە خەلاتی پێشانگای ئاژەلانی پێدرابوو، شەوی ڕابردوو خەوێکی سەیری دیوە و دەیهەوێ بۆ ئاژەڵەکانی تری وەگێڕێ. بڕیار درابوو هەر کە مەترسی ئاغای جۆنز لە ناودا نەما، تێکڕا لە عەممارە گەورەکە کۆ ببنەوە. مێجری پیر(هەموو کات ئەویان بەم ناوە بانگ دەکرد ئەگە چی بە نازناوی ویلنگدێن لە پێشانگاکەدا بەشداری کردبوو) تا ئەو ڕادەیە جێی ڕێز بوو کە هەموو

ئاژەڵەکان ئامادە بوون کاتژمێرێک لە کاتی خەوی خۆیان بۆ بیستنی وتەکانی تەرخان بکەن.

لە سەرووی عەممارەکە، مێجێر، لە بەرزاییەکی شێوە سەکۆ لە سەر تۆزێک بەڵمەگیا ڕاکشابوو. دوازدە ساڵ لە تەمەنی تێپەڕیبوو. لەم دواییانەدا تۆزێک لەش قورس و قەڵەو ببوو، بەڵام سەرەڕای ئەمانەش یەکانەیەکی بەشکۆ بو. هەرچەند کە بڕەکانی هیچ کات هەڵنەکەندرابوون، بەڵام ڕواڵەتێکی دڵ ڕەحم و لێزانی هەبوو. زۆری نەخایەند کە هەموو ئاژەڵ و پەلەوەری ناو مەزراکە، بە شێوەیەکی تایبەت بە خۆیان، خڕ بوونەوە.

لە پێشدا سەگەکان، بلۆبڵ و جێسی و پێنجر هاتن، پاشان بەرازەکان لە پێش سەکۆکە لە سەر بەڵمە گیاکان جێگیر بوون. کەڵەباب و مریشکەکان لە سەر لێوارەی پەنجەرەکە هەڵنیشتن و کۆترەکان بە باڵ لێدان چوونە سەر نیرگەی عەممارەکە. مەڕ و گاگەلەکەش لە پشت سەری بەرازەکانەوە مۆڵین و دەستیان کرد بە کاوێژکردن.

ئەو دوو ئەسپەش کە داشقەکەی جۆنزیان ڕادەکێشا (باکسەر و کلوور) پێکەوە هاتنە ژورەوە. لە ترسی ئەوەی کە نەوەک گیان لەبەرێکی چکۆلە ژێرپێ بنێن، سمە گەورە تووکنەکانیان بەهێمنی لە سەر عەرز دادەنا.

کلوور ماینێکی قەڵەو و جوانعەمر بوو، پاش بە دونیا هێنانی چوارەمین جوانووی کە تێکشکا، چیتر وەک خۆی لێنەهاتەوە.

باکسەریش، بارگینێکی درشت بوو کە بەرزاییەکەی دەگەیشتە هەژدە بست. لە تاقەتیشدا هێزی دوو بارگینی ئاسایی هەبوو. خەتێکی سپی بە بەر لمبۆزیەوە بوو کە ڕواڵەتێکی گەوجانەی پێدابوو. لە ڕاستیشدا لە ڕیزی زیرەکاندا نەبوو، بەڵام خۆڕاگری و تاقەت و تواناکەی ببووە هۆی ئەوە کە

جێی ڕێزی هەمووان بێ.

دوای ئەسپەکان موریل بزنە سپییەکە و بنجامینی گوێدرێژ وەژوور کەوتن. بنجامین پیرترین و نەگونجاوترین ئاژەڵی ناو مەزراکە بوو. قسەی نەدەکرد، کە شتێکیشی بگوتبایە ڕەق و بە تەوس و توانج بوو. بۆ وێنە دەیگوت: «خودا کلکی داومێ کە مێشی پێدەرکەم ، بەڵام خۆزگە نە کلکی دەدامێ و نە مێشیشی دروست دەکرد». لە ناو ئاژەڵ و پەلەوەرەکانی مەزراکە، تەنیا ئەو بوو کە هیچ کات پێنەدەکەنی و هەر کاتیش هۆکەیان لێدەپرسی، دەیگوت: «شتێکی وانابینم شیاوی پێکەنین بێ».

سەرەڕای ئەمانەش، بێئەوەی نیشانی بدا، ڕێزی بۆ باکسر هەبوو. ئەم دووانە واتە بنجامین و باکسەر، هەموو ڕۆژێکی یەکشەممە، بێ ئەوەی یەکتر بدوێنن، لە سەوزەڵانی پشت مەزراکەدا، پێکەوە دەلەوەڕان. دوو ئەسپەکە تازە جێگۆرکێیان کردبوو کە پۆلێک بێچووە مراوی بێ دایک بە واقەواق وەژوور کەوتن. لەم لا بۆ ئەولا بە شوێن جێیەکدا دەگەڕان کە ژێر سم و لاقان نەکەون. کلوور بە دوو دەستەکانی خۆی شێوە حەسارێکی بۆ دروست کردن و جووجکەکانیش هەر بەدوای نیشتەجێ بوونیان کەوتنە وهنەوز دان.

لە دوایین کاتدا مالی، ئەو ماینە حۆلە سپییەی کە کالیسکەکەی ئاغای جۆنزی ڕادەکێشا، لە کاتێکدا کە کلۆ قەندێکی دەکروشت، بە ناز و مەکرەوە هاتە ژوورەوە.

لە شوێنێکی بەرچاو ڕاوەستا و هەوڵی ئەدا سەرنجی ئەوانیتر بۆ سەر و یاڵ و بەرچاویلکەکەی ڕابکێشێ. لە دوای هەموویان پشیلە بۆر هات و بە پێی داب و نەریتی خۆی بۆ دۆزینەوەی شوێنێکی گەرم و نەرم چاوێکی بە عەممارەکەدا گێڕا و پاشان بە زۆر خۆی لە بەینی باکسەر و کلوور خزاند

و بە ئاسوودەیی دەستی کرد بە وەنەوزدان و پرخە پرخ. تەنانەت یەک وشەش لە وتەکانی مێجرِ تێنەگەیی.

بێجگە لە مۆزز، قەلەڕەشەماڵییەکەی ئاغای جۆنز، کە بە سەر پەلەدارێکی سەربانەکەوە خەوی لێکەوتبوو، هەموو ئاژەڵەکان هاتبوون. کاتێک مێجر دڵنیا بوو هەموو جێگیر بوون و چاوەڕوانن، دوو قۆزەی لە خۆی هێنا و گەرووی ساف کرد و بەمجۆرە دەستی پێکرد:

«هاوڕێیان، هەموو سەبارەت بەو خەوە سەیر و سەمەرەی کە دوێنێ شەو دیومە، کەم تا کورت شتێکتان بیستووە. لەمەڕ چی و چۆنی خەوەکە لە دواییدا دەدوێم.

بەڵام ئێستا شتێک هەیە کە دەمهەوێ لەو بارەوە تۆزێک بدوێم. تکایە بە وردی گوێ بۆ وتەکانم ڕادێرن. هاوڕێیان پێم وا نییە من زیاتر لە چەند مانگیتر لەناو ئێوەدا بمێنم. وا هەست دەکەم کە لە سەرمە و ئەرکی سەر شانمە پێش ئەوەی مردن بەرۆکم بگرێ، زانیاری و ئەزموونی ئەم چەند ساڵەی تەمەنی خۆمتان بۆ باس بکەم. من تەمەنێکی درێژم هەیە. لە تەویلەدا مۆڵەتی بیرکردنەوەی زۆرم هەبووە، واش دێتە بەرچاوم کە دەتوانم بڵێم بەڕادەیەک زیاتر لە ئێوە لە ڕواڵەتی ئەم جیهانە تێگەیشتوویم هەیە و هەر لەم بارەشەوە دەمهەوێ لە گەڵتانا بدوێم».

«هاوڕێیان، ڕاستییە نهێنییەکانی ژیانی ئێمە چییە؟ دەبێ بڵێین کە ژیانمان کەم و کورتە. بە زەحمەت و نەهامەتییە. کە دێینە دونیاوە هەموو کات زگ برسی و چاو لە دەستی مرۆڤین. لە ناو ئێمەدا ئەوەی بە تاقەتە، بە هۆی مرۆڤەکانەوە ژێر کار دەخرێ. ژیانی هەر کام لە ئێمە نەبوونی و کولەمەرگی و نۆکەرییە. ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە».

«بە ڕای ئێوە ئەم شێوە ژیانە ویستی سروشتە؟ بە ڕای ئێوە ئەم وڵاتە

ئەوەندە نەدار و نەبووە کە دانیشتوانی بۆ تێر نابێ؟ هاوڕێیان، نا، نا! هەزاران جار نا! وڵاتی بەریتانیا، بە بەر و بوومە و باری کەش و هەواشـــی لەبارە و بڕشـــتی بەرهەم هێنانی خواردنی بۆ ڕێژەیەکی زۆر زیاتر لەوانەی هەیە کە ئێستا تێیدا دەژین.

هەر ئەم مەزرایەی ئێمە دەتوانێ دوازدە ئەســـپ، بیست سەر گاگەل و سەدان مەڕ ڕابگرێ. زۆریش شیاوتر لە ئێستا کە تێیدا هەین. ئاسایشتێک کە لە مێشکی ئێمەدا ناگونجێ!

ئەی کەوابوو ئێستا چۆنە کە ئێمە لەم نەهامەتی و نەگبەتییەدا دەژین؟»

«هۆیەکەی ئەمەیە کە مرۆڤ زۆربەی زۆری دەستڕەنجی ئێمە دەدزێ. بەڵێ هاوڕێیان وڵامی هەموو پرســـیارە ســـەرەکییەکانی ژیانمان لە یەک خاڵدا کۆ دەبێتەوە و ئەویش ئەوەیە کە مرۆڤ تەنیا دوژمنی ڕاســـتەقینەی ئێمەیـــە. مرۆڤ لە مەیدان دوور بخەنەوە و ڕەگ و ڕیشـــاڵی برســـیەتی و بێگاری هەڵکەنن».

«مرۆڤ تەنیا بوونەوەرێکە کە دەخوا و دەخواتەوە، بەڵام هیچ بەرهەمێکی نییـــە. نە شـــیر دەدا، نە هێلکە دەکا. زۆریش لەوە بـــێ هێزترە کە بتوانێ ئێرەخ ڕاکێشـــێ. لە ڕاکردندا هێواشە و کەروێشکی پێ ناگیرێ و سەرەڕای ئەمانەش بەسەر هەموو بوونەوەرەکاندا زاڵە!»

هەر مرۆڤە کە ئەوان ژێر کار دەکێشـــێ و لە داهاتەکەشیان ئەوەندەیان ئەداتـــێ کە نەمرن لە برســـان. هێزی ئێمەیە کـــە زەوی دەکێڵێ. هەر بە پەینی ئێمە گژوگیای ناو زەوییەکە بەرهەم دێت، بەڵام ســـەرەڕای ئەمانە هێشتا خاوەنی پێستی خۆشمان نین.

ئێوە ئەی ئەو گاگەلەی کە مۆڵیون، ساڵی ڕابردوو چەند بەرمیل شیرتان لێ دۆشـــراوە؟ ئەو شیرەی کە دەبوایە گوێلکەکانی خۆتانی پێ تێر بکرایە،

چی بەسەر هات؟

دڵۆپ بە دڵۆپی لە گالۆکی دوژمنەکانمانەوە چووەتە خوارەوە.

ئەی ئێوە مریشــکە پۆپە لارەکان، پار چەند هێلکەتان کردووە؟ لەسەر چەندیــان کڕ کەوتن و بوونە جووچک؟ هەموو بــردران بۆ بازار و بە پارە گۆڕدرانەوە و چووە گیرفانی جۆنز و کەسەکانییەوە. ئەی تۆ کلوورا ئەو چوار جوانووەی کە دەبوایە سەری پیری دار عەسای دەستت بوونایە، لە کوێن؟ هەموو پاش ساڵێک فرۆشران و تۆش هەرگیز چاوت پێیان نەکەوتەوە.

لــە جێی ئەو چــوارە، بێجگە لە کەمێک کا و جۆ و گۆشــەی تاریکی تەویلە، چیت پێ برا؟»

«تازە ناهێڵن، ئەم ژیانە نەگبەتییەی ئێمە ئاسایی بێتەوە. من لە لایەن خۆمــەوە هیچ گلەییم نییە. بــۆ؟! بە و هۆیەوە کە من لــەو چەند ئاژەڵە بەختەوەرەی ناو مەزراکە بووم.

دوازدە ســاڵ لە تەمەنم تێپەڕ بووە. پتر لە چوارســەد بزەڵەم لێ بووە. ژیانی ئاسایی هەموو بەرازێک بەم جۆرەیە. بەڵام لە ناو ئێمەدا بە دەگمەن ڕوو دەدا یەکێکمان چەقۆی قەســابی بەر نەکــەوێ و زگی مرۆڤەکان بە گۆشتی خۆی تێر نەکات.

ئێوە ئەی بزەڵە خرپنەکان، لە ماوەی ساڵێکدا قیژەی هەمووتان لە سەر تەختەی قەساب، دەگاتە حەوت تەبەقەی ئاسمان.

ئەم بەڵایە بە ســەر هەمــوو ئێمەی بەراز، گاگەل، مریشــک و مەڕ و بزنەکاندا دێت.

تەنانەت ئەسپ و سەگەکانیش لە ئێمە باشتر نین.

تۆ باکســـرا ڕۆژێک کــە هێز و توانایی نەمێنێ، جۆنز دەتفرۆشـــێ بە قەسابێک تا لەت و کوتت بکەن و بەردەم سەگە ڕاوچییەکانت بخەن. تازە

کاتێک کە ســـەگەکانیش پیر بوون، جۆنز بەرد بە ملیانەوە دەبەستێتەوە و لە نزیکترین زەلیان دەهاوێت، بۆ ئەوەی بخنکێن.

«ئێستا هاوڕێیان! ئایا وەک ڕۆژ لێتان ڕوونە کە هەموو ئەم نەگبەتیانەی کە بەسەرمان دێت بە هۆی ستەمی مرۆڤەکانەوەیە؟

ڕەگەزی مـــرۆڤ لەناو ببەن و ببنە خاوەنـــی بەرهەمی ڕەنجی خۆتان. ئەوکات دەتوانین سەربەخۆ و دەوڵەمەند بین. ئەی چی بکەین؟! زۆر ئاسانە! دەبێ شەو و ڕۆژ بۆ لەناو بردنی مرۆڤ تێبکۆشین.

هاوڕێیان پەیامێک کە ئێستا بۆم هێناون ڕاپەڕینە!

من نازانم هەلی ئەم ڕاپەڕینە ،کەی و چۆن بۆمان دەڕەخسێ. بۆی هەیە حەفتەیەکیتر، یان نا زیاتر لە یەک ســـەدەی تر. بەڵام چۆن دەزانم ئەمەی لـــە ژێر پێمەوەن کایە، ئـــاواش لێم ڕوونە کە درەنگ یان زوو، دادوەری لە ناو هەموو گیانلەبەران جگە لە مرۆڤ بڵاو دەبێتەوە.

هاوڕێیان لەم ماوە کورتەی ژیانتانا، ئەم وتانەی من لە بیر نەکەن!

لە هەمووشـــیان پێویســـتتر ئەمەیە کە وتەکانم بگێڕنـــەوە بۆ ئەوانەی کە دوای من دێنـــە دونیاوە، بۆ ئەوەی چینی داهاتوومان تا ســـەرکەوتن نەسرەون».

«هاوڕێیان نابێ هەرگیز لە ســـەر ئەم ڕاســـتیانە دوودڵ بن. هیچ کات نابێ بەو کەســـانەی کە دەڵێن؛ مرۆڤ و ئـــاژەڵ لە قازانج و زەرەردا وەکوو یـــەک وان، باوەڕ بکەن. یان ئەوانەی وا دەڵێن مرۆڤ و گیان لەبەرانیتر بۆ بەختەوەری یەک خولقاون، بزانن کە ئەمانە هەمووی درۆن. هیچ مرۆڤێک لە پێناو بەرژەوەندی ئاژەڵێکدا تێناکۆشێ.

هەموو مرۆڤەکان بۆ ئێمە دوژمنن و ئاژەڵیش هەموو دۆستی یەک».

لەم کاتەدا جەنجاڵێکی ســـەیر بەرپا بوو. لە کاتێکدا کە مێجر خەریکی

قســـە کردن بوو، چوار مشکە کوێرە لە کونەکانی خۆیان خزابوونە دەرێ و گوێیان دابووە قسەکانی مێجر. سەگەکانیش لەگەڵ چاویان پێیان دەکەوێ، فرکەتەیان کردنە سەر. ئەوانیش بە پەلە گیانی خۆیان رزگار کرد.

مێجر چمکی خۆی بە مانای بێ دەنگبوون بەرز کردەوە.

گوتـــی: هاوڕێیان لێرەدا شـــتێک هەیە کە دەبـــێ ڕوون وەبێ، ئەویش ئەمەیە کە ئایا مشـــک و کەروێشک کە ماڵی نین، لە ڕیزی دۆستەکانمانن یا دوژمنانمان؟ وەرن با دەنگی بۆ بدەین. من پێم وایە کە ئەم مەســـەلەیە کە ئایا مشـــکەکان لە دۆســـتانن، دەبێ لە کۆبوونەوەیەکدا قسەی لە سەر بکرێ و دەنگی بۆ بدرێ.

بـــە خێرایی دەنـــگ درا و بە زۆرینەی دەنگـــەوە وەرگیران. تەنیا چوار دەنگی «نا»ی تێدا بوو. سێ سەگ و یەک پشیلە. لە کۆتاییدا ڕوون بووەوە کە پشیلە دەنگی ئەرێ و نای بۆ هەردووکیان داوە.

مێجر درێژەی بە وتەکانی دا.

«وتەیەکـــی دیکـــەم نییە، بـــەس دووپاتی دەکەمەوە کە بۆ هەمیشـــە دوژمنایەتی مرۆڤ بە ئەرکی سەر شانتان بزانن. هەر گیانلەبەرێک لە سەر دوو لاق دەڕوا، دوژمنە و هەر گیانلەبەرێکیش لە سەر چوار پێ دەڕوا، یان نا باڵی هەن، دۆستمانە.

هەر وەها لە بیرتان بێ کە لە شەڕ لەگەڵ مرۆڤدا نابێ هیچ کات چاوی لێبکەن و وەک ئەوان بژین، تەنانەت ئەو کاتەش کە بە سەریاندا زاڵ بوون.

هیچ ئاژەڵێک بۆی نییە لە ناو ماڵدا بحەوێتەوە، لەســـەر تەخت بخەوێ، جل و بەرگ بپۆشـــێ و ئەلکول بخواتەوە و تووتن بکێشـــێ. هیچ ئاژەڵێک بۆی نییە دەست لە پارە بدات و سەودای پێوە بکا.

هەموو خووەکانی مرۆڤ پیس و ناحەزن. لە هەمووان گرنگتر ئەوەیە کە

کەس بۆی نییە لەگەڵ هاوڕەگەز و هاوجۆری خۆی بە توندی بجووڵێتەوە و غـــەدری لێبکا. توانا و لاواز، زیرەک و گەلحـــۆل، هەمووی برای یەکن. هیـــچ ئاژەڵێک بۆی نییە ئاژەڵێکیتـــر لە ناو ببات. هەموو ئێمە وەکوو یەک بنەماڵەین.

ئێستاش هاوڕێیان دەچینەوە سەر باسی خەو بینینی شەوی ڕابردووم. من ناتوانم ئەم خەوەتان بۆ شی بکەمەوە. خەونێک بوو لە بارەی ڕۆژگارێک کە توخمی مرۆڤ لە ناو چووبوو، بەڵام ئەو خەوە شـــتێکی وەبیر هێنامەوە کە ماوەیەک بوو فەرامۆشم کردبوو.

ساڵانی پێشووو ئەوکات کە بزەڵەیەک بووم، دایکم و بەرازە مێیینەکان ســـروودێکی کۆنیان دەخوێندەوە کە بێجگە لە ئاهەنگ و دوو سێ وشەی سەرەکی شتێکی تریان لە یاد نەمابوو.

من ئـــەو ئاهەنگەم هەر لە منداڵییەوە دەزانی، هەرچەند ماوەیەکی زۆر بوو لە بیرم چووبووەوە، بەڵام شـــەوی ڕابردوو لەخـــەودا بیرم هاتەوە. لەو سەیرتر ئەوەیە کە وشەکانیشم بیر هاتنەوە، بەڵێ وشە بە وشەی. دڵنیام!

ئەو وشـــانەی کە لـــە زۆر کۆنەوە لە لایەن گیانلەبـــەرە چوار پێکانەوە دەگوترانەوە و ماوەیەکی زۆرە لە بیرکراون. من هەر ئێستا ئەم سروودەتان بۆ دەخوێنمەوە. پیرم و دەنگ زڕا وو بێ تین، بەڵام ئێوە کاتێک ئاهەنگەکە فێر بوون، دەتوانن بە باشـــی بیخوێننەوە. ناوی ئەم ســـرووده «ئاژەڵەکانی ئینگلیزە».

مێجر قوڕگی خۆی پاک کردەوە و دەســـتی کـــرد بە خوێندنەوە. هەر بەو جۆرە کە گوتبووی دەنگی زڕا و نزم بوو. بەڵام بە شێوەیەکی زۆر باش خوێندییەوە. ســـروودێکی هەست بزوێن بوو. ئاهەنگەکەشی وەک ڕستەی نێوان «کۆلماتین و لاکۆکاراچ» بوو. سروودەکە ئەمە بوو.

گیـــان لەبەرانـــی دونیـــا
گــوێ ڕادێــرن بــۆ ئێمـــه
مـــزگێنیتـــان پـــێ دەدەیـــن
گـــوێ بـدەن بــەم بەڵێنە

بــه هیـــوای ڕۆژێکـــی وا
لــه مــرۆڤ پــاک بــێ دونیا
ئــەم دونیــا ســەوز و جوانــه
هــەر بــۆ ئێمــە بــێ تەنیــا

نەمێنـــێ ژێــر چـــەپۆکی
دەســـت و پێوەنـــد، بێــگاری
ســەر بڕیــن، کوشـــتن، لێدان
ســـتەم، زوڵـــم و زۆرداری

گەنم و جـــــۆ و سەوزەڵانی
وێنجــە، ڕووەکـــی ڕووبــار
هــەر شـــتێک لــه گڵ بڕوێ
دەیخۆیـــن بە بێ ڕەنـــج و کار

کانیــاو و جــۆگــە، پــڕ ئــاو
پێدەشـــتەکان، ســەوز و جوان
فێنکایی و خــۆشــی کوێستان
خەڵاتێکــە بــۆ هەمـــــووان

ڕۆژێکـــــــی وا دەبینیـــــن
دێتەوە دەورێکـــی خــــــۆش
گاگەل، ئێســـتر، گشـــت ئاژەڵ
هەمـــوو پێی دەبـــن مەدهۆش

گـــیـــان لەبەرانـــــی دونیـــا
گـــــوێ ڕادێـــرن بـــۆ ئێمـــە
مـــــزگێنیتـــان پـــێ دەدەین
باوەڕ کـــەن بـــەم بەڵـــــێنە

خوێندنـــەوەی ئەم ســـرووده هەســـتی ئاژەڵەکانی بزواند. هێشـــتا مێجر ســـرووده‌کەی تەواو نەکردبوو کە هەموو لە بەر خۆیانەوە دەستیان کرد بە خوێندنەوەی. تەنانەت هەرە حۆلەکەشـیان توانی ئاهەنگەکەی و دوو سێ وشـــەی فێر بێت و زیرەکەکانیش وەکوو بەرازەکان و سەگەکان لە ماوەی چەند خولەکێکدا هەموویان لەبەر کرد. دوای ماوەیەکی کورت لە ڕاهێنان، هەموو ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە پێکەوە یەک دەنگ سرووده‌کەیان خوێندەوە.

گاگەل بە هۆڕە هۆڕ، سەگەکان بە لوورەلوور، مەڕ بە بارەبار، ئەسپەکان بـــە حیلکە حیلک و مراوییـــەکان بە قیرەقیر. ئەم ســـرووده بە ڕادەیەک هەســـتی هەمووانـــی بزواندبوو کە پێنج جاران بـــە دوای یەکدا دووپاتیان کردەوە. کێ دەزانێ کە ئەگەر ڕووداوێک نەدەقەوما، تا بەیانی دەیانگوتەوە.

بـــە داخەوە ئەم هـــەرا و هوریایە، ئاغای جۆنزی لە خـــەو ڕاپەڕاند. لە قەرەوێڵەکـــەی هاتە خوارەوە و بە باوەڕی ئەوەی کـــە ڕێوی هاتووەتە ناو مەزراکەوە تفەنگەکەی هەڵگرت و فیشـــەکێکی بە تاریکیەکەوە هەڵتۆقاند.

دیواری تەویلەکە چەند ســـاچمەی بەرکەوت و کۆ بوونەوەکە هەڵوەشایەوە و هەمـــوو چوونەوە شـــوێنی حەوانەوەیان. پەلەوەر چوونە ســـەردارەکان و ئەوانەش کاوێژکەر بوون لە ســـەر بەڵمە گیاکە مانەوە. لە چەند ســـاتێکی کورتدا بێدەنگی باڵی بەسەر مەزراکەدا کێشا.

□

## وەرزی ٢

دوای سێ شەو مێجری بە ساڵاچوو لە کاتی خەودا مرد و تەرمەکەی لە بەشی خوارەوەی باخەکە، نێژرا. ئەم ڕووداوە لە سەرەتای مانگی مارسدا بوو، تا سێ مانگ کاری نهێنی و شەوانە زۆر بە وریاییەوە بەڕێوە دەچوون.

وتەکانی ئەو شەوەی مێجر ببووە هۆی ئەوە کە ئاژەڵە ژیرەکان بە چاوێکی کراوەتر بڕواننە بار و دۆخەکە. ئەوان نەیاندەزانی ئەو ڕاپەڕینەی کە مێجر باسی لێکردبوو کەی و چۆن سەر هەڵئەدا. بە مێشکیشیاندا نەدەهات کە ئەم ڕاپەڕینە لە ماوەی ژیانی ئەواندا ڕووبدات. بەڵام بە ئەرکی خۆیان دەزانی کە خۆی بۆ تەیار بکەن. کاروباری ڕاهێنان و سەرپەرشتی، لە ئەستۆی بەرازەکان بوو. ئەوان بە ژیر و وریا ناسرابوون.

لە هەمووان بەرچاوتر و زاناتر دوو بەرازی نێری جوانعەمر بوون بە ناوەکانی سنۆباڵ و ناپلیۆن کە ئاغای جۆنز ئەوانی بۆفرۆش دابەستە کردبوون. ناپلیۆن قەڵافەتێکی درشت و تووڕە و تووشی بوو. ئەو لە ناو مەزراکەدا بەوە ناسرابوو کە قسەزان نییە، بەڵام قسەی خۆی دەباتە سەر.

سنۆباڵ بەرازێکی بزێو بوو. قسەزان و کارزان، بەڵام خۆڕاگری ناپلیۆنی نەبوو.

بەرازەکانی تری مەزراکە قەڵەو و تەوەزەل بوون و لە هەموویان بەرچاوتر، بەرازێکی چکۆلە و قەڵەو بوو بە ناوی سکوئیلەر کە گووپ خڕ و چاو زیتەڵە بوو. تووند و چالاک بوو. دەنگێکی ناسکی هەبوو. قسە زانێکی لێهاتوو بوو. کاتێک لە سەر ئاریشەیەک ئەدوا بە جۆرێک قوژبناو قوژبنی دەکرد و کلکی بە پەلەپەل هەڵدەسووڕاند کە باوەڕی بە گوێگرەکانی دەهێنا. لەسەر سکوئیلەر دەگوترا کە دەتوانێ ڕەش بە سپی بنوێنێ!

ئەم سێ بەرازە ئامۆژگارییەکانی مێجریان وەک باوەڕێکی تۆخ پەرە پێدا و ناوی «ڕێچکەی ئاژەڵ»یان لێنا. چەند شەو لە حەفتەدا دوای نووستنی جۆنز کۆبوونەوەی نهێنیان لە تەویلەکاندا پێک دەهێنا و ئەو شتانە کە پێداویستی یەک ئاژەڵە، بۆ ئەوانی تریان شی دەکردەوە.

لە سەرەتاوە ئاژەڵەکان بە بێ وازی دەیانڕوانییە کۆبوونەوەکان، چەند دانەیان، دەمیان لە وەفاداری بە جۆنزەوە وەردەدا و ئەویان وەک خاوەنی خۆیان دەناسی و جار بە جاریش قسەی بێ کەڵکیان دەکرد.

وەکوو ئەم وتانە: «جۆنز گیامان پێ ئەدا، بەخێومان دەکا، گەر جۆنز نەبێ هەموو لە برسان دەمرین!» پۆلێکی تر پرسیاری وایان دەکرد کە دەبوونە هۆی دڵساردی، وەکو: «بە ئێمە چی کە دوای مردنمان چی ڕوو ئەدات؟»

یا دەیانگوت: «گەر ڕاپەڕین هەر سەر هەڵئەدا، تێکۆشان یان هەوڵ نەدانی ئێمە چ دەستێکی کاریگەری دەبێ لەم ڕووداوەدا».

بەرازەکان بۆ ئەوە پێیان بسەلمێنن کە ئەم پرسیار و وتانە دوورە لە ڕۆحی ئاژەڵ بوونیان، کۆسپی زۆریان دەهاتە ڕێ. زۆربەی ئەم پرسیارە بێ

کەڵکانە لە لایەن مالی، مایینە سپیەکەی جۆنزەوە دەهاتنە ئاراوە. یەکەم پرسیاری ئەو لە سنۆبال ئەمە بوو: «بەڕای تۆ دوای ڕاپەڕین قەند دەست دەکەوێ؟» دیسانەوە مالی پرسیاری کرد، «ئایا من دەتوانم دیسان بەر چاویلکە و ملوانکەی جوانم هەبێ؟»

سنۆباڵ لە وەڵامدا گوتی: «هاوڕێ ئەم بەر چاویلکە و ملوانکە و گوڵینگانەی کە تۆ تا ئەو ڕادە خۆشت دەوێن، نیشانەی کۆیلایەتیی تۆن. قەبووڵ ناکرێ کە ئازادی لەم شتانە بە نرختر بێ!»

مالی قەبووڵی کرد بەڵام دیار بوو دڵنیا نەبوو.

کێشەی سەرەکی بەرازەکان بە درۆ خستنەوەی موزز، قشقرەماڵییەکەی جۆنز بوو. موزز سیخوڕ و قسەبەر بوو، سەرەڕای ئەمانەش، وتە بێژێکی زۆر چالاک بوو. دەیگوت من وڵاتێکی سەیر دەزانم بە ناوی شیر و هەنگوین کە هەموو ئاژەڵەکان پاش مردن دەچنە ئەوێ. موزز دەیگوت ئەو وڵاتە لە ئاسمانە و تۆزێک لە سەرووی هەورەکانەوەیە.

دەیگوت لەوێ هەر حەوت ڕۆژی حەفتە یەک شەممەیە. لە هەموو وەرزەکانی ساڵدا وێنجە و شەوەر هەیە و دارەکان نەبات دەگرن.

بە هۆی ئەوەوە کە موزز سیخوڕ بوو کاری نەدەکرد. ئاژەڵەکان ڕقیان لێی بوو. بەڵام تاق تاقی ئاژەڵەکان باوەڕیان بە بوونی وڵاتی شیر و هەنگوین هەبوو. بۆ ئەوەی بەرازەکان پێیان بسەلمێنن کە موزز دِرۆ ئەکا، لە ڕووی ناچارییەوە دەکەوتنە قسە و بەڵگە هێنانەوە.

فەرمانبەرترین ئاژەڵ بۆ بەرازەکان باکسر و کلوور، دوو ئەسپە بارەبەرەکەی جۆنز بوون.

چارەسەر کردنی زۆر کێشە و ئاریشە بۆ ئەم دووانە دژوار بوو، بەڵام لەو کاتەوە بەرازەکانیان بە مامۆستای خۆیان زانی، هەموو ڕێنماییەکییان

وەردەگرت و بە زمانێکی ســاکار فێری ئەوانیتریــان دەکرد. هیچ کات لە چــوون بۆ کۆبوونەوە نهێنییەکان دوا نەدەکەوتن. خوێندنەوەی ســروودی گیانلەبەرانــی ئینگلیــز کــە هەمــوو کات دوای کۆتایــی کۆبوونەوەکان دەخوێندرایەوە، لە لایەن باکسر و کلوورەوە ڕابەری دەکرا.

بە ڕێکەوت ڕاپەڕینەکە زووتر و ئاســانتر لــەوەی کە چاوەڕوان دەکرا، ڕووی دا. ڕاســته کە ئاغای جۆنز ئەربابێکی دڵڕەق و ناجوامێر بوو، بەڵام لە ساڵانی ڕابردوودا وەرزێرێکی لێهاتوو بە توانا بوو. لەم دواییانەدا تووشی ڕۆژ ڕەشی هاتبوو. لەدوای ئەوەی لە ململانێیەکی دادوەریدا شکستی هێنابوو، پاش زەرەری ماڵی توشی شێوە خەمۆکییەک هاتبوو. هەر بەم هۆیەوە ملی دابووە مەی خواردنەوە.

زۆربەی ڕۆژان، تا ئێوارە لە چیشــتخانەکەدا لە ســەر کورسییە دارەکە دادەنیشت و خۆی بە خوێندنەوەی ڕۆژنامەوە خەریک دەکرد و بە دەمیەوە دەیخواردەوە.

جار بە جار لەتە نانێکی لە ناو عارەقەکەدا دەخووساند و دەیدا بە موزز. بەردەســتەکانی، ناڕاســت و لەش قورس بوون. مەزراکە پڕ ببوو لە بژار و ماڵەکە پێویســتی بە نۆژەن کردنەوە بوو. پەرژینەکان هەموو شەقارشەقار ببوون. زۆربەی ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە برسی و نیوە تێر بوون.

مانگــی ژوئەن هــات و وێنجەکە ئامــادەی دروونەوە بوو. لە شــەوی نیوەی هاویندا کە هاوکات بوو لەگەڵ ڕۆژی شــەممە، ئاغای جۆنز چوو بۆ ولینگدێن. لە مەیخانەی شێرەســوور تا ئەو ڕادە خواردیەوە کە نەیتوانی تا نیوەڕۆی یەکشەممە بگەڕێتەوە.

کارەکــەرەکان مانگاکانیــان دۆشــی و بــێ ئەوەی لە بیــری ئالیکی ئاژەڵەکاندا بن، خۆیان بە ڕاوە کەروێشــکەوە سەرقاڵ کرد. ئاغای جۆنزیش

دوای گەڕانەوەی لە ســەر کورسییەک، لاپەڕەی ڕۆژنامەیەکی خستە سەر دەم و چــاوی و خەوی لێکەوت. ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە تا شــەو بێ تفاق و خواردن مانەوە. برســییەتی زۆری هێنــا. یەکێک لە مانگاکان بە هێزی شــان و شاخی خۆی دەرکەی کادێنکەی شکاند و تێکڕا دەستیان کرد بە خــواردن. هەر لەم کاتەدا بوو کە جۆنز بەئاگا هاتەوە و لەگەڵ چوار کەس لە بەردەستەکانی قامچی بە دەست لە دەرکەی کادێنەکەوە، وەژوور کەوتن و بێ وەستان، دەستیان کرد بە لێدانی ئاژەڵە برسییەکان.

بەڕاســتی ئەمە ئیتر لە تاقەتی ئەم برســییانە بەدەر بوو. هەر بۆیە بێ بیر کردنەوە و پیلان دارشــتنێکی پێشــووو، هەڵمەتیان بردە ســەر جۆنز و دارودەســتەکەی. لە هەموو لایەکەوە بەر شــاخ و لەقە دەکەوتن. نەیان دەتوانی هێوریان بکەنەوە. تا ئێســتا هەڵــس و کەوتی وایان لە ئاژەڵەکان نەدیبوو. ئەم ڕاپەڕینــە کوتووپڕە لە لایەن ئەو ئاژەڵانەی کە هەرکات هەر چــۆن پێیان خۆش بوو لە گەڵیاندا جووڵابوونەوە، هێزی بیر کردنەوەی لە جۆنز و دار و دەستەکەی بڕی.

دوای ماوەیەکی کورت کە زانیان هیچیان بۆ ناکرێ هەڵاتن. دوای چەند خولەکێک هەر چوار و پێنجیان لەســەر جادەی عارەبانەکەوە بەرەو جادە پانەکە ڕایان دەکــرد. خانمی جۆنزیش کە ئەم ڕووداوەی لە پەنجەرەکەوە دەدی، بــە پەلە تۆزێک کــەل و پەلی لە بوخچێکەوە پێچا و لە ڕێگایەکی نهێنییەوە هەڵات. موززیش کە بەســەر دارێکەوە هەڵنیشــتبوو بە قارەقاڕ دوای کەوت.

لە ماوەیەکی کورتدا، ئاژەڵەکان جۆنز و پیاوەکانیان لە جادەکەش دوور خستەوە و دەروازە گەورەکەیان لە سەر داخستن بێ ئەوەی بۆخۆیان بزانن کە چۆن بوو، ڕاپەڕین دەستی پێکرد و تەواویش بوو. جۆنز هەڵات و مەزرا

کەوتە دەست ئاژەڵەکان.

لە یەکەم ساتەکانی سەرکەوتندا کەس باوەڕی نەدەکرد. یەکەم کاریان ئـــەوە بوو کە هەموویان مەزراکە بگەڕێن تا دڵنیابن کە هیچ مرۆڤێکی تێدا نەماوە.

بە چوار ناڵ و تەقلە غار بە دەوری باخەکەدا گەڕان. لە پاشـــاندا چوونە ناو ماڵی مەزراکەوە تا دوایین شـــوێنەوارەکانی جۆنز بسڕنەوە. دەرگای ئەو عەممارەی کە لە پشـــت تەویلەکەوە بوو شکا. دەمبێن، لووتەوانە، زنجیری سەگەکان و ئەو چەقۆ تیژانەی کە جۆنز، بەراز و بەرانەکانی پێ دەخەساند و ســـەردەبڕی، هەموو خرانـــە ناو چاڵاوەکەوە. هەوســـار و لەغاوەکان، بەر چاویلکە و تۆبەرە بێ کەڵکەکان، خرانە ناو ئەو ئاگرەی کە لە ناو باخچەکەدا داگیرسابوو. قامچییەکانیش هەر بەو جۆرە.

کاتێک ئاژەڵەکان قامچییەکانیان لە ناو ئاگرەکەدا دی کە دەســـووتێن، دەســـتیان کرد بە خۆشی دەربڕین. ســـنۆباڵیش ئەو گوڵینگە و ڕووبانانەی کە ڕۆژگارێک کلک و یاڵی ئەســـپەکانیان پێ دەڕازاندنەوە، لە ناو ئاگرەکە هاویشـــت و گوتی: «ڕووبان وەک جل و بەرگی مرۆڤ وایە و هێمایەکە لە مرۆڤایەتی. ئاژەڵ دەبێ ڕووت بێت». باکسر بە بیستنی ئەم قسە ئەو کڵاوە حەســـیرەی کە لە گەرمای هاویندا پارێزگاری لە گوێچکەکانی دەکرد و لە مێشەکان دەیپاراست، لەگەڵ شتەکانیتر لە ئاگرەکەی هاویشت.

لە ماوەیەکی کورت زۆربەی ئەو شـــتانەی کە جۆنزی دەهێنایەوە بیری ئاژەڵەکان، لەناوچوون. پاشـــان ناپلیۆن ئەوانی بردەوە بۆ ناو تەویلەکە و بە هەر کامیان دوو ئەوەندەی جیرەی پێشوویان خواردنی پێدان، بە هەرکام لە سەگەکانیش دوو بسکیتی دا. هەموو خۆیان بۆ خەو ساز کرد و نووستن. نووستنێک کە تا ئەوکات وێنەی ئەویان لە خەویشدا نەدیبوو.

بــەڵام هەمــوو وەک ڕۆژانی پێشــووو بەیانی زوو هەڵســان و ڕووداوە پڕشــکۆکانی شەوی پێشووویان وەبیرهاتنەوە و بە کۆمەڵ بەرەو لەوەڕگاکە ڕۆیشــتن. بارستایەکی داپۆشــراو بە گژوگیای، لێبوو کە سوار بوو بە سەر هەموو مەزراکەدا. ئاژەڵەکان چوونە سەر ئەو شوێنە و لەبەر گزنگی بەیانیدا، تێر سەیری دەور و بەری خۆیان کرد. ئەوەی کە ئەیاندی، ئی خۆیان بوو.

ســەرخۆش لەم ڕووداوانە کەوتنە سەر سەما و غارکردن و باز بازێن و فرت و هووڕ. لەناو شەونم و گوڵاڵەکاندا خۆیان دەگلاندەوە و لە هەموو ئەو گیا شیرین و بەتامانە خۆیان تێر کرد.

گڵمەتەکانیان ورد کرد و بۆنی گیاکانیان هەڵمژی. لە دوای هەموو ئەو کارانە، ســوورێک بە دەوری مەزراکەدا گەڕان و هاوکات لەگەڵ ئەوەی کە بە بێدەنگی چاویان دەگێڕا بە ســەر کێڵگە و باخ و ئەســتێر و دارســتانە چکۆلەکەدا، بارەقەڵا و دەستخۆشیان لە خۆیان دەکرد.

جۆرێک دەیانڕوانییە ئەم شتانە کە دەتگوت پێشتر هیچ کامیان نەبینیوە. ئێســتاش بە ئەستەم باوەڕیان دەکرد کە خاوەنی ئەم مەزرایە و هەموو ئەو شــتانەن کە تێیدایە. پاشان هەموو بەرەو بینای مەزراکە ڕیزەڵەیان بەست و لە پشت دەرگاکە بێدەنگ ڕاوەستان. ئەم بینایەش هی ئەوان بوو، بەڵام دەترسان بچنە ناویەوە.

دوای ماوەیەکی کورت، ســنۆباڵ و ناپلیۆن دەرگاکەیان بە هێزی شان کردەوە.

دانەدانە، بە دوای یەکدا بەوپەڕی وریایی و وردبینییەوە هەنگاویان نایە نــاو بیناکەوە. هەر بە هێمنی هۆدە بە هۆدە گەڕان. دەترســان بە دەنگی بەرز لەگەڵ یەک بدوێن. بە ترســەوە دەیانڕوانییە کەل و پەلە جوانەکان. تەختی خەوەکان و دۆشەکە پەڕەکان، ئاوێنە، قاڵی دەستکردی برۆکسل و

قاپی وێنەکەی شـــاژنەویکتۆریا کە لە سەرووی شۆمینەی ژووری میوانەکە هەڵواسرابوو.

تـــازە گەڕابوونەوە دەم دەرگاکەوە کە هەســـتیان بە نەبوونی مالی کرد. وەرسووڕانەوە و بینیان کە لە ژووری خەوەکەیە. رووبانێکی ڕەنگ شینی لە ســـەر مێزی تەوالیتەکەی خانمی جۆنز هەڵگرتبوو بە سەر شانەکانی بەری دابووەوە و بە شـــێوەیەکی گەوجانە لە بەر ئاوێنەکەدا خۆی دەنواند. زۆری بە سەردا هاتن و لۆمەیان کرد. تێکڕا لە ژوورەکە چوونە دەرەوە.

چەند پارچە گۆشـــتی بەراز کە لە ناو چێشـــتخانەکەدا هەڵواســـرابوون داگیران و ژێر گڵ خران. بەرمیلە شـــەرابەکەش کەوتە بەر لەقەی باکسر و تێکشکا. بێجگە لەم دوو شتە دەست لە هیچیتر نەدرا. هەموو ڕایان لەسەر ئـــەوە بوو کە بیناکـــە وەک مۆزەخانەیەک بپارێـــزرێ و بڕیاریش درا هیچ ئاژەڵێک بۆی نییە لەم بینایەدا بژی. هەموو ناشتایان کرد و پاشان سنۆباڵ و ناپلیۆن دیسان لە شوێنێکی دیاریکراودا کۆیان کردنەوە.

ســـنۆباڵ گوتی: هاوڕێیان، کاتژمێر شەش و نیوە و ڕۆژێکی درێژمان لە پێشە. ئەمڕۆ خەریکی درورنی وێنجەکە دەبین، بەڵام شتێکی تر هەیە کە دەبێ بەم نزیکانە لە سەری بدوێین.

بەرازەکان ئەوەیان درکاند کە لە ماوەی ســـێ مانگی ڕابردوودا، لەڕووی کتێبـــە کۆنەکانی منداڵەکانی جۆنـــزەوە کە لە زبڵدانەکـــەدا بوون، فێری نووســـین و خوێندنەوە بوون. ناپلیۆن ئەمری کرد کە ڕەنگی ڕەش و سپی هەڵگرن و بەرەو دەرگا گەورەکەی مەزراکە ڕێکەون.

پاشـــان بە هۆی ئەوەی کە ســـنۆباڵ لە ئەوانی تر باشـــتر دەینووسی، فڵچەیەکی باریکی خســـتە بەینی سمەکانیەوە و وشەکانی مەزرای مانێری سڕییەوە و لە جێی ئەوان بە ڕەنگی سپی نووسی: «قەڵای ئاژەڵان» تا لەوە

بە دوا بەو ناوە بناسرێت.

پاشـــان هەموو بەرەو مەزراکە گەڕانەوە و ناپلیۆن و ســـنۆباڵ ناردیان تا نەردیوانێکیان هێنا و بە دیواری تەویلەکەوە هەڵیان پەســـارد. گوتیان کە لە ماوەی ســـێ مانگ دەوامدا توانیویانە کـــە بنەمای ئاژەڵبوون لە حەوت بڕگەی دەســـتووریدا وەک یاســـایەک، کورت بکەنەوە. ئەم حەوت بڕگە لە سەر دیوارەکە دەنووسرێتەوە و گۆڕانیشیان تێدا نابێ. هەموو ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە لە ســـەریانە بەرێزەوە ملکەجیان بن و لێیان لا نەدەن. سنۆباڵ بە لەقەلەق بە ســـەر نەردیوانەکەدا سەرکەوت و دەست بەکار بوو. سکووئیلێر چەند پلە بەرەو خوارتر قاپە ڕەنگەکەی بۆ گرتبوو.

حەوت بڕگەکە لە سەر دیوارە ڕەشەکە بە پیتی سپی درشت کە لە سی مەترییەوە دەخوێندرانەوە بەم جۆرە نووسران.

حەوت بڕگەی یاسای قەڵای ئاژەڵان:

١. ئەوەی دوو پێیە، دوژمنە.

٢. ئەوەی چوار پێیە یان دوو باڵی هەیە دۆستە.

٣. هیچ ئاژەڵێک بۆی نییە جل و بەرگ بپۆشێ.

٤. هیچ ئاژەڵێک لەسەر تەخت ناخەوێ.

٥. هیچ ئاژەڵێک ئەلکول ناخواتەوە.

٦. هیچ ئاژەڵێک ، ئاژەڵێکیتر لە ناو نابات.

٧. هەموو ئاژەڵەکان یەکسانن.

زۆر بە خاوێنی نووســـرا، جگە لەوەی کە جل بە چل نووسرابوو و یەکێک لە واوەکان سەروژێر بوو، ئەوانیتر سەرڕاست بوون.

ســـنۆباڵ هەر حەوت بڕگەکەی بـــە دەنگی بەرز خوێنـــدەوە. تێکڕای ئاژەڵـــەکان بە ســـەرلەقاندن، ڕەزامەنـــدی خۆیان دەربـــڕی و زیرەکەکان

دەستیان کرد بە لەبەرکردنی بڕگەکانی یاساکە.

ســـنۆباڵ فلْچەکەی فڕێدا و هاواری کرد: «ئێستاش هاوڕێیان، با بڕۆین بەرەو وێنجەزارەکە. وەرن با هەموو وێنجەکە لە ماوەیەکی کورتتر لە جۆنز و پیاوەکانی کۆ وەکەین».

بەڵام لەم کاتەدا ئەو ســـێ مانگایە کە ماوەیەک بوو بێ تاقەت دەهاتنە بەرچاو بە دەنگی بەرز دەســـتیان کرد بە هۆڕە هۆڕ. بیست وچوار کاتژمێر بوو کە نەدۆشـــرابوون و گوانەکانیان لێ بەگیر وێستابوون. بەرازەکان دوای ماوەیـــەک بیر کردنەوە، ناردیان بە دوای چەند ســـەتڵ و ســـەرکەوتووانە مانگاکانیان دۆشین و زۆری پێ نەچوو کە شەش سەتڵی پڕ لە شیری کەف کردوو لە پەنای یەکدا ڕیز کران. زۆربەی ئاژەڵەکان بە ئیشـــتیا و کەیفەوە چاویان لە سەتڵەکان بڕین. یەکیان گوتی ئەم هەموو شیرە چی لێبکەین؟

یەکێک لە باڵندەکان گوتی: جۆنز جار و بار تۆزێکی لێ هەوێن دەکرد. ناپلیۆن خۆی خستە بەر سەتڵەکان و هاواری کرد:

«هاوڕێیان ســـەیری ســـەتڵە شـــیرەکان مەکەن! لە دواییدا مشووریان دەخۆین. ئێستا گرنگ کۆ کردنەوەی بەرهەمی کشت و کاڵەکەمانە. هاوڕێ ســـنۆباڵ پێشـــڕەوتان دەبێ. منیش دوای ماوەیەکی کورت دەگەمە لاتان. هاوڕێیان بۆ پێشەوە ، وێنجە چاوەڕوانتانە».

بەم جۆرە ئاژەڵەکان پێکەوە بۆ کۆ کردنەوەی وێنجەکە ڕێکەوتن. شـــەو گەڕانەوەو سەیریان کرد کە شیری لێنەماوە!

□

## وەرزی ٣

چەند هیلاک بوون و چەندیان ئارەق ڕشت تا توانیان وێنجەکە کۆ وەکەن و لە کادێنی کەن، بەڵام ئیشـــەکەیان بە نرخ و بایەخدار بوو. زیاتر لەوەی چاوەڕوان دەکرا سەرکەوتووانە بوو.

زۆر جاران ئیشـــەکان دژوار بوون، ئاخر ئەو ئامێرانەی بەکار دەهێنران، بۆ مرۆڤەکان دروست کرابوون نەک بۆ ئاژەڵەکان و هەروەها ئاژەڵەکان هیچ کام نەیان دەتوانی ئامێرێک کە مەرجی ئیش پێکردنی ڕاوەســـتان لەسەر دوو پــێ بــوو بەکار بهێنن، بەڵام بەرازە ژیر و وریاکان بۆ هەر کۆســـپێک ڕێگا چارەیەکیان دەدۆزیەوە. ئەســـپەکان کە بســـت بە بستی مەزراکەیان دەزانـــی و تێیدا گەڕابوون، لــە کار و باری دروێنە و گڵ هێنان لە جۆنز و کارەکەرەکانی زۆر وەستاتر بوون. بەرازەکان کاریان نەدەکرد، بەس بەسەر کاری ئەوانی دیکەدا ڕادەگەیشتن و سەرپەرشتیان دەکرد.

ئاسایی بوو کە بە هۆی زانیاری و زیرەکی زیاتر، ڕابەر و پێشەوا بن.

باکســـر و کلوور خۆیان بە ئامێری دروێنە و کێڵان و ... وە دەبەستەوە

(هەڵبەتە ئەم ڕۆژانە پێویستیان بە هەوسارو لەغاو نەبوو) و دەورادەوری مەزراکەیان بە هەنگاوی قورس و پتەو دەپێوا و یەکێک لە بەرازەکان بە دوایاندا دەڕۆیی و جاربەجاریش دەیگوت: «هاوڕێ هەچە!» یان «هاوڕێ چۆۆۆۆش»! هەموو ئاژەڵەکان و تەنانەت کەم هێزەکانیش لە کار و باری مەزراکەدا بەشدارییان دەکرد، تەنانەت مراوی و مریشکەکانیش لە بەر تیشکی هەتاودا ڕەنجیان دەکێشا و وردە و پردەی وێنجەکانیان بە دەندووکیان کۆ دەکردەوە. لە ئەنجامدا کاری خەرمان هەڵگرتنەوە و کێشان، دوو ڕۆژ زووتر لە کاتی جۆنز و کارەکەرەکانی تەواو بوو. هەروەها زۆرترین ڕێژەی بەرهەمێک بوو کە مەزراکە تا ئێستا بە خۆیەوە دیبووی. هیچ شتێک بە فیڕۆ نەچووبوو. قاز و مراوییەکان بەو چاوە تیژانەی خۆیان دوا لاسقی وێنجەکەیان کۆ کردبووەوە و لە هەموو مەزراکەشدا هیچ بوونەوەرێک بەقەد دەنکە نیسکێکی دزی لە بەرهەمەکە نەکردبوو. لە هەموو وەرزی هاویندا ئیش و کاری مەزراکە بە بێ دەغەڵی کردن و دوا کەوتن لەو پەڕی ڕێک و پێکیدا بەڕێوە دەچوو. ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە بە ڕادەیەک کەیف خۆش بوون کە تا ئەوکات لە مێشکی هیچ کامیاندا نەگونجابوو. پاروو بە پاروو تام و چێژێکی تایبەتی هەبوو. لە بەر ئەوەی کە ئەم خواردنە هەمووی ئی خۆیانە و بە دەستی خۆشیان بەرهەم هێنراوە، هەر بۆیەش لەگەڵ ئەو خواردنەی کە بە دەستی خاوەنە پیسکەکەیان بە سەریاندا دابەش دەکرا، جیاوازییەکی زۆری هەبوو.

بە ڕۆیشتنی مرۆڤە سەربار و بێ کەڵکەکان خواردنێکی زیاتریان هەبوو، هەرچەند کە لە کارەکاندا دەست هەڵێن و مامۆستا نەبوون بەڵام کاتی پشوودانی زیاتریان هەبوو. هەڵبەتە گیر و گرفتی جۆراوجۆریان بۆ دەهاتە پێش. وەکوو دوای دروون و کۆ کردنەوەی دەغڵ و دانەکە دەبوایە وەک

کۆن بە سـمی خۆیان گێرەی بکەن و بە فوو لێ کردنیش کا و دانەکەی لە یـەک جیا بکەنەوە، ئاخـر مەزراکە ئامێری گێرەکردنـی نەبوو، بەڵام ئـەم جارەش بەرازەکان بە زیرەکی و لێهاتوویی و باکسـر بە هێزی بازوو کارەکەیان بردە پێش و تەواویان کرد.

باکسر لە ڕاپەڕاندن و بۆ پێشەوە بردنی کارەکان جێی ئافەرینی هەموو بوونەوەرەکانی ناو مەزراکە بوو. پێشـتریش ئازا و پڕکار بوو، بەڵام ئێسـتا زیاتر لە هەموو کات وەک ئەسـپێکی ئازا و پاڵەوان دەهاتە بەرچاو. ڕۆژی وا هەبوو، زۆرینەی ئەرکەکان دەهاتە سـەر شانی ئەو. بەیانی تا ئێوارە هەر شـتێکی قورس و دژوار هەبوایە لە ئەستۆی ئەو بوو. داوای لە کەڵەبابەکە کردبـوو کە بەیانیان زووتر لە ئەوانیتر بە ئاگای وەکا تا لە هەر شـوێنێک کارێکی ناتەواو هەبێ بە مەیلی خۆی تەواوی بکات.

هەرکات گرفتێک یان پرسـیارێک پێش بهاتبایە، وەڵامی باکسر ئەمە بوو: «من زیاتر کار دەکەم». ئەم وەڵامەی کردبوو بە دروشـمی خۆی. هەر کەس بە پێی توانای خۆی ئیشـی دەکرد. مراوی و مریشـکەکان لە کاتی خەرمان هەڵگرتندا نزیک لە پەنجا کیلۆ دەغڵی بڵاوە بوویان کۆ دەکردەوە. نە کەسـێک دزی دەکرد و نە کەسـیش لە بەشـی خۆی ناڕازی بو. شەڕ و کێشـە و جووتە هاویشـتن و گاز گرتن و لە یەک مڕاندن کە شـتێکی ئاسایی ناو ئاژەڵەکان بوو، باوی نەمابوو و تۆوی هەڵگیرابوو. کەس خۆی لە کار نەدەدزییەوە. هەڵبەت «مالی» بەیانان تۆزێک درەنگ لە خەو هەڵدەستا و لـە کاتی کار کردنیشـدا بە بیانووی جۆراوجۆر کاری بەجێدەهێشـت. هەڵس‌وکەوتی پشیلەکەش بە جۆرێک نامۆ دەهاتە بەر چاو. هەر لە زووەوە کاتـی ئیش بـزر دەبوو و لە دوای تەواو بوونی ئیشـەکە و پێگەیشـتنی خواردن، قـوت دەبووەوە. هەموو کاتیش بە شـێوەیەک بۆ بزر بوونەکەی

پاســـاوی دەهێنایەوە و بە جۆرێک میاومیاوی دەکرد کە کەس شکی سەر نەدەبرد کە درۆ دەکات. «بنجامین» کەرە پیرەکە، لەدوای ڕاپەڕینەکە هیچ گۆڕانێکی بەســـەردا نەهاتبوو. وەک پێشـــووو لە کاردا کەللەڕەق و خاو و خلیچک بوو. نە خۆی لە کار دەدزیەوە و نە کاری زیاتری دەکرد. هیچ کات لە بارەی ڕاپەرینەکە و دەستکەوتەکانی نەئەدواو هەرکاتیش لێیان دەپرسی کـــە ئایا خۆت لە دەورەی جۆنـــز بە بەختەوەرتر نازانـــی، بەس دەیگوت: «جەماعـــەت کـــەر تەمەن درێژن. هیچ کام لە ئێوە تاکوو ئێســـتا کەرێکی مردووتان نەدیوە». ئەوانیش ناچار بەم وڵامە توێکڵداره ڕازی دەبوون.

یەکشەممانە پشوو بوو. ناشتا، یەک کاتژمێر درەنگتر لە کاتە ئاساییەکان دەخورا و دوای ئەویش ڕێوڕەسمێکی بێ وەستان و بە پەلە بەڕێوە دەچوو. پێشـــەکی ڕێوڕەســـمەکە هەڵکردنی ئاڵا بوو. سنۆباڵ لە عەممارەکە، پەڕۆ کۆنێکی سەوزڕەنگی پەیدا کردبوو کە ئی خانمی جۆنز بوو. لە سەر پەڕۆکە بە ڕەنگێکی ســـپی، وێنەی سمێک و شاخێکی کێشابوو. ئەم ئاڵایە ڕۆژانی یەکشەممە لە حەوشەکەدا هەڵدەدرا.

سنۆباڵ دەیگوت ڕەنگی ئاڵاکە سەوزە، لە بەر ئەوەی هێمایەکە بۆ مەزرا سەرسەوزەکانی ئینگلستان. سم و شاخەکەش هێمای کۆمارە داهاتووەکەی ئاژەڵەکانە کە لە دوای کوشـــتن و لـــە ناو بردنی مرۆڤەکان دادەمەزرێ. لە دوای هەڵدانـــی ئاڵاکە، هەموو ئاژەڵی مەزراکـــە لە تەویلەکە کۆبوونەوەیان هەبوو کە پێیان دەگوت «میتینگ». لەو کۆبوونەوەدا کار و باری حەوتووی داهاتـــوو دەخرایە بەر باس و لێکۆڵینـــەوە و بڕیاری دەرکراویش بە دەنگی بەرز دەخوێندرانەوە. هەموو کات بەرازەکان بڕیاردەر بوون و ئەوانی دیکەش هیـــچ کات نەیاندەتوانی بڕیارێک دەرکەن، بەڵام فێـــری دەنگدان ببوون. ســـنۆباڵ و ناپلیۆن لە باســـی ڕاوێژەکان لە هەمووان پڕکارتر بوون، بەڵام

ئەمەش دەزانرا کە ئەم دووانە هیچ کات یەک دەنگ نەبوون. پێشـــنیار لە لایــەن هەر کامێکیان بووایە، ئەوی دیکەیان دژی دەوەســـتا. تەنانەت لەو شـــتانەش کە لە بنەڕەتەوە جێی هیـــچ دژایەتییەک نەبوو. وەکوو تەرخان کردنــی پارچـــە زەوییەک لە پشـــت باخەکەوە بۆ ئـــەو ئاژەڵانەی کە پیر و پەرکـــووت و لەکارکەوتوو بوون. دوایین بەشـــی هەمـــوو ئەو میتینگانە، خوێندنەوەی سروودی «ئاژەڵەکانی ئینگلیز» بوو.

دوانیوەڕۆش تەرخان کرابوو بۆ حەسانەوە.

بـــەرازەکان عەممارەکەیان کردبوو بە بنکەی ســـەرکردایەتی. شـــەوانە لـــەوێ لەڕووی ئەو کتێبانەی کە لە ماڵەکەی جۆنـــزەوە گوێزرابوونەوە، بۆ ئەوەی فێری ئاسینگەری، دارتاشـــی و پیشە پێویستەکانیتر ببن، سنۆباڵ خەریکـــی پێکهێنانی تەشـــکیلاتێک بـــوو کە پێیان دەگوتـــرا «کۆمیتەی ئاژەڵی». لەم ئیشەشـــدا زۆر ماندوو نەناســـانە هەوڵی دەدا. بۆ مریشکەکان کۆمیتـــەی هێلکەکەران، بۆ گاگەلەکە کۆمیتـــەی کلک تیژان و کۆمیتەی پێدا چوونەوەش بۆ فێر کردن و بار هێنانی هاوڕێ ڕام نەبووەکان (مەبەست ڕام کردنی مشـــک و کەروێشـــک و ... بوو). بۆ مەڕەکان کۆمیتەی خوری ســـپییەکان و زۆر کۆمیتەی دیکەش دامەزران. هەروەها چەند خولێک بۆ فێر کردنی خوێندن و نووســـین دامەزرابوو. هـــەر چەند کە ئەم بیرۆکانە هەر زوو شکســـتیان هێنـــا، وەکوو کۆمیتەی پێداچوونـــەوە کە هەر دوای دامەزراندن هەڵوەشـــایەوە. هۆکارەکەشی ئەمە بوو کە ئاژەڵە ڕام نەبووەکان لە ســـەر خوو ڕەوشـــتی خۆیان لایان نـــەدەدا و هەرکاتیش لە گەڵیان لە ڕووی یاساوە دەجووڵانەوە، یاخی دەبوون. پشیلە بووە ئەندامی یەکێک لەم کۆمیتانە و چەند ڕۆژیش زۆر تێکۆشـــەر بوو. ڕۆژێک هاوڕێکانی دیبوویان کە لە سەر بانەکەوە وەستاوە و لەگەڵ چۆلەکەکان کە لە دوورە دەستیەوە

وەستابوون دەدوا. دەیگوت ئێستا هەموو ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە لەگەڵ یەک هاورێن و هەر چۆلەکەیەک ئارەزووی هەبێ دەتوانێ بفڕێ و لەسەر چمکەکانم بنیشێتەوە. بەڵام چۆلەکەکان پتر لێی دوور دەکەوتنەوە.

خولەکانی فێرکردنی خوێندن و نووسین، سەرکەوتووانە بەڕێوە دەچوون. لە پاییزدا زۆربەی زۆری ئاژەڵەکان کەم تا کورت فێری نووسین و خوێندنەوە ببوون.

بەرازەکان بە تەواوی خوێندنەوە و نووسینەوە فێربوون. سەگەکان لە خوێندنەوەدا باش بوون، بەڵام لە حەوت فەرمانەکە زیاتر، تامەزرۆی خوێندنەوەی شتیتر نەبوون.

موریل «بزنە سپیەکە» لە خوێندنەوەدا لە سەگەکان باشتر بوو. جاربەجاریش پەڕێکی لە ڕۆژنامەی ناو زبڵدانەکەی بۆ ئەوانیتر دەخوێندەوە.

بنجامین بەباشی بەرازەکان فێر ببوو، بەڵام کەڵکی لێ وەرنەدەگرت. دەیگوت تا ئەو شوێنەی بزانم شتێک نییە کە شیاوی خوێندنەوە بێ. کلوور زۆربەی پیتەکانی دەزانی، بەڵام لە دروست کردنی وشەدا کۆڵ بوو. باکسر لە پیتی «ت» بەر نەکەوت. بە سمە گەورەکەی لە سەر گڵەکە ئەلف ـ ب ـ پ ـ ت ی دەکێشانەوە و لە دواییدا بە گوێی تەپەوە دەیڕوانییە پیتەکان. جار بە جاریش باڵەکانی دەجووڵاند و بە هەموو تواناوە دەیویست پیتەکانی دواییشی بیر بێنێتەوە. بەڵام بێسوود بوو. چەند جاریش چ ـ ح ـ خ ـ فێر ببوو، بەڵام هەرکات کە ئەوانی لە بیر بوون بۆی دەردەکەوت کە ئەلف و ب و پ و ت ی لە بیر چوونەتەوە. لە پاشاندا بەو باوەڕە گەیشت کە ئەو چوار پیتەی بەسە و هەموو ڕۆژێک یەک دوو جاران بیاننووسێتەوە بۆ ئەوەی لە بیری نەچنەوە.

مالی لە چوار پیتی ناوەکەی خۆی زیاتر نەیویست شتێکی تر فێر

ببێ. ئەم پیتانەی بە لقی ناسکی دارەکان دروست دەکرد و بە چەند گوڵ دەیڕازاندنەوە و بە ئافەرین گوتن بە خۆی بە دەورەیاندا دەگەڕا. ئەوانیتر لە پیتی ئەلف زیاتر شــتێک فێر نەبوون. هەروەها دواتر دەرکەوت کە ئاژەڵە گێژەکان وەکوو مەڕ ـ مریشــک و مراوییــەکان، توانایی فێر بوونی حەوت فەرمانەکەیان نییە.

ســنۆباڵ دوای ماوەیەک بیر کردنەوە، ڕایگەیاند کە حەوت فەرمانەکە، بە «چوار پێ بــاش و دوو پێ خراپ» کورت دەبێتەوە. هەروەها گوتی ئەم دروشمە بریتییە لە بنەمایەکی ئاژەڵی. هەرکەس بە باشی لە ناوەڕۆکەکەی تێبگا لە شــەڕ و کێشــەی مرۆڤ بــەدوور دەبێ. لە ســەرەتادا باڵندەکان ناڕەزایەتی خۆیان دەربڕی.

ئاخر ئەوان لە ڕوواڵەتدا دوو پێیان هەیە، بەڵام سنۆباڵ پێی سەلماندن کە بەو جــۆرە نییە. گوتی: «هاوڕێیان، باڵی پەلــەوەر، ئەندامێکە بۆ فڕین و ڕۆیشــتن نەک بۆ کۆکردنەوەی دانەوێڵە و شــتی وا، هەر بۆیە دەکرێ وەک پێ بێنە ئەژمار. دەســت هێما و نیشانەی مرۆڤە کە بەو دووانە، کارە ناپەسەندەکانی خۆی ئەنجام ئەدا».

باڵندەکان شتێکی ئەوتۆ لە وتە دوور و درێژەکانی سنۆباڵ تێنەگەیشتن، بەڵام شیکردنەوەکەیان وەرگرت و هەموو خۆیان بۆ فێربوونی دروشمی نوێ ئامادە کرد. «چوار پێ باش، دوو پێ خراپ» لە ســەر دیواری قەڵاکە و لە ســەرووی حەوت فەرمانەکەوە بە پیتی درشت نووسرایەوە. کاتێک فێری بوون، مەڕەکان زۆر خولیای بوون کە هەرکات لە ناو مەزراکەدا پشــوویان دەدا، «چــوار پــێ باش، دوو پێ خراپ» یان بە بارەبــاڕ بۆ ماوەیەکی درێژ دەگوتەوە بێ ئەوەی ماندوو ببن.

ناپلیۆن زبانی خێری لە ســەر کۆمیتەکانی سنۆباڵ نەدەگێڕا و دەیگوت

کە ڕاهێنانی گەنجەکان لە پێش هەر کارێکەوەیە کە بمانهەوێ بۆ پیرەکانی بکەین.

هەر لەم کاتانەدا بوو کە دوای کۆ کردنەوەی وێنجەکە، جێسی و بلوبڵ بە هەر دووکیان نۆ توولەی ساغ و جوانیان بوو. ناپلیۆن توولەکانی دوای گیرانەوەیان لە شیر لە دایکەکانیان ستاند و گوتی بۆخۆم سەرپەرشتی گەورەکردن و ڕاهێنانیان دەکەم. هەر زوو ئەوانی بۆ باڵا خانەی سەر ئەنبارییەکە ڕاگوێست و لە وەها دوورەپەرێزیەکدا ڕایگرتن کە پاش ماوەیەک لە بیر چوونەوە. موشکیلەی شیرەکەش تەواو بوو. هەموو ڕۆژێک لەگەڵ خواردنی بەرازەکان تێکەڵ دەکرا. سێوەکانیش گەیین و بندارەکان بە سێوە وەریوەکان داپۆشرا. ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە وایاندەزانی کە سێوەکان لە ناو هەموویاندا وەک یەک دابەش دەکرێ، بەڵام فەرمانێک دەرچوو کە هەر بەو هۆیەوە سێوەکان کۆکرانەوەو بۆ خواردنی بەرازەکان بردرانە ناو عەممارەکەوە. دوای دەرچوونی فەرمانەکە کۆمەڵێک لە ئاژەڵەکان دەنگی نارەزایەتیان بەرز بووەوە، بەڵام بێسوود بوو. چون هەموو بەرازەکان تەنانەت سنۆباڵ و ناپلیۆنیش لە بەڕێوەچوونی ئەم فەرمانەدا یەکدەنگ بوون. هەروەها سکوئیلەر ئەرکی شیکردنەوە و ڕازی کردنی ئاژەڵەکانی پێ سپێردرا.

بە دەنگێکی بەرز گوتی: «هیوادارم هاوڕێکان وایان بیر نەکردبێتەوە کە ئێمەی بەراز ئەم ئیشەمان لە ڕووی خۆپەسەندی و زۆردارییەوە کردبێت. زۆربەی ئێمەی بەراز شیر و سێومان پێخۆش نییە. تەنانەت من بۆ خۆم ڕقم لەم دوو خواردنەیە. تەنیا مەبەستمان لە خواردنی شیر و سێو لەش ساغیمانە. شیر و سێو (لە ڕێگای زانستییەوە دەرکەوتووە، هاوڕێیان!) کانزاگەلێکیان تێدایە کە دەبنە هۆی لەشساغی بەرازەکان، هەر

بۆیە پێویسـتە بۆمان. ئێمەی بەراز ئیشـەکانمان بە مێشک و بیرە. هەموو کارە تەشـکیلاتیەکانی مەزراکە پێوەندی بە ئێمەوە هەیە و ئێمەش شـەو و ڕۆژ هەوڵ ئەدەین لە پێناوی پێش بردنی شـێوەی ژیانی ئاژەڵەکانی ناو مەزراکەدا تێبکۆشـین. تەنیا لە بەر ئێوەیە کە شـیر و سێو دەخۆین. ئێوە دەزانن کە ئەگەر ئێمە ئەرکەکانمان بە باشی بەڕێوە نەبەین چی دەقەومێ؟ جۆنز دەگەڕێتەوە! بەڵێ، جۆنز دەگەڕێتەوە!».

لە کاتێکدا هات و چووی دەکرد و کلکی هەڵدەسووڕاند و بە شێوەیەکی پاڕانـەوە و داواکاریانە هاواری کرد: «هاوڕێیان بە دڵنیاییەوە دەڵێم کە هیچ کام لە ئێوە گەڕانەوەی جۆنزی ناوێ و پێی خۆش نییە!».

نەبوونی ویسـتی گەڕانەوەی جۆنز یەکێک لـەو بابەتانە بوو کە لە ناو ئاژەڵەکاندا بە کۆی دەنگەوە پەسـەند دەکرا. کاتێک بەم جۆرە کۆتایی بە وتارەکەی هێنا، ڕێی هەموو قسـە و باسـێکی بڕی. گرنگی ڕاگرتنی لەش ساغی بەرازەکانیش کە ڕوون و ئاشکرا بوو. هەر بۆیەش بێ هیچ لێدوانێک ڕازی بوون کە شیر و سێوە بارێزەکان و هەروەها سێوی سەردارەکان پاش پێگەیشتنیان تەرخان بکرێن بۆ بەرازەکان.

□

# وەرزی ۴

تــا ئاخر و ئۆخری هاوین قســە و باســی قــەڵای ئاژەڵان لــە ناو نیوەی گوندەکەدا بڵاو ببووەوە. هەموو ڕۆژێک سنۆباڵ و ناپلیۆن پۆل پۆل کۆتریان بــۆ مەزراکانی دەور و بەر دەنــارد تا لەگەڵ ئاژەڵەکانیــان تێکەڵ ببن و چیرۆکــی ڕاپەڕینەکەیان بۆ وەگێڕن و خوێندنەوەی ســروودی (ئاژەڵانی ئینگلیز) یان فێر بکەن.

زۆربەی ئەم کاتانە ئاغای جۆنز لە مەیخانەکەی «شێری سوور» دادەنیشت و بۆ هەر کەس کە تاقەتی بیســتنی هەبوایە، باســی ستەم و زۆرێکی لە ڕادە بەدەری دەکرد کە لە لایەن پۆلێک ئاژەڵی بێ بایەخ لێی کرابوو و لە موڵک و ماڵی خــۆی وەدەریان نابوو. جوتێر و خاوەنی موڵک و مەزراکانی دەور و بەریش هاودەردییان لەگەڵ دەکرد و بەڵام لە ڕاستیدا یارمەتییەکی شــایانیان پــێ نەدەکرد. هــەر کام لەوان لەم بیرەدا بــوون کە چۆن لەم لێقەوماوی و ماڵ وێرانییەی جۆنز بە قازانجی خۆیان کەڵک وەرگرن.

بە خۆشــییەوە نێوانی خــاوەن مەزراکانی دەور و بــەر خۆش نەبوو و

هەمیشــە خەونی گولیان بەیەکترەوە دەدی. یەکێــک لەو دوو مەزرایەی نزیک مەزرا ســەربەخۆکە «فاکس وود»ی ناو بوو. مەزرایەکی بەر فراوان و لــە بیر چوو و کۆن بوو. بــە داری بێبەر و لەوەڕگەی بێ‌کەڵک و پەرژینی شکاو و لاڕووخاوەوە.

خاوەنەکەی ئاغای پیل کینگتن، پیاوێکی خوێڕی ونەکەرکار کە زۆربەی کاتی خۆی بە پێی کات و وەرز، خەریکی ڕاو و شکار بوو. مەزراکەی دیکە کە ناوی «پێنج فیلّد» بوو، بچووکتر بوو، بەڵام باشــتر چاوەدێری لێکرابوو. خاوەنەکەی ئاغای فریدریک ناوێک بوو تووڕە و وریا. زۆربەی کات گیرۆدەی قڕە و هەرا بوو و لە کەسابەتدا بە پیاوێکی قیڕ ناسرابوو.

ئــەم دوو کەســە تا ئەو ڕادە ڕقیان لە یەک بوو کــە تەنانەت لە پێناو بەرژەوەندییەکانی هاوبەشیان یەکیان نەدەگرت.

سەرەڕای ئەمانە ئاگاداری ڕاپەڕینەکەی قەڵای ئاژەڵان بوون و دەترسان. زۆریش وریا بوون کە نەهێڵن ئاژەڵی مەزراکانیان شــتێک لەو بارەوە بزانن. لە ســەرەتای ڕاپەڕینەکە جۆرێک خۆیان نیشــان دەدا کــە ئەو ڕاپەڕینە شــتێکی ســووک و بێ مانایە. دەیانگوت ئاژەڵەکان هیــچ کات ناتوانن لە ئیدارە کردنی مەزراکە سەرکەوتوو بن. باوەڕیان وابوو کە دوو حەوتوو زیاتر ناخایەنێت کە پیلانەکەیان پووچەڵ دەبێتەوە.

بڵاویــان کردەوە کــە لە مەزرای مانێر (پێیان لە ســەر ئەوە دادەگرت کــە بە مانێر ناوی بێنن و ناوی قەڵای ئاژەڵانیان بە لاوە قورس و ناخۆش بــوو) هەمووی ئاژەڵەکان کەوتوونەتە گیانــی یەکتر و بەمزووانە هەموو لە برســان قڕ دەکەن. کاتێک ماوەیەک تێپەڕی و ڕوون بووەوە کە هیچ کام لە ئاژەڵەکان لە برسانا نەمردوون، فریدریک و پیل کینگتن شێوازی قسەی خۆیان گۆڕی و لە سەر گەندەڵی و کوشتن و بڕینی ترسێنەری ناو قەڵاکەوە

دەدوان. بڵاویـــان کردەوە کە لەوێ ئاژەڵـــەکان یەکتر دەخۆن و یەکتر بە ناڵی ســـوورەوەبوو ئەشـــکەنجە و ئازار دەدەن و مێیینەکانیان هاوبەشـــە و بێشـــەرەفی و بێئابڕوویی هەموو مەزراکەی تەنیوەتەوە. فریدریک و پیل کینگتـــن دەیانگوت ئەمە هەمووی بە هۆی ســـەرپێچی کردن لە یاســـای سروشتە.

بەڵام ئەم چیرۆک و پروپاگەندانە بـــە تەواوی مانای خۆیەوە، باوەڕیان پێنەکرا. بەســـەرهاتی مەزرایەکی سەیر و سەرســـوورهێنەر کە ئاژەڵەکان مرۆڤەکانیـــان لەوێ وەدەرنـــاوە و بۆ خۆیان بەڕێوەی دەبەن، بە شـــێوەی جۆراوجۆر بڵاو دەبووەوە و کەوتبووە ســـەر زاران. هەر لەو ســـاڵەدا بوو کە شەپۆلێک لە سەرهەڵدان و ڕاپەڕین لە ناو مەزراکانی دەور و بەردا ڕووی دا.

گاجووتەکان کە هەموو کات گوێ بیستی جوتێرەکان بوون لە ناکاو یاخی بوون. بەنداو و پەرژینەکانیان تێکشـــکاند و هێرشیان کردە ناو شەوەرەکان. مانگاکان بە لەقە ســـەتڵە شیرەکانیان ڕشت. ئەسپی ڕاوچییەکان لە پەڕین بە سەر بەرزاییەکاندا ژێوان بوونەوە و سوارەکانیان لە گڵدا گلاند.

لە هەموو گرنگتر ئەوە بوو کە لە هەموو شـــوێنێک ســـروودی ئاژەڵانی ئینگلیـــز دەزانرا و بڵاو ببووەوە. مرۆڤەکان خۆیان وا نیشـــان دەدا کە ئەم قســـە و باســـانە پروپاگەندەن، بەڵام نەیاندەتوانی هێمنـــی خۆیان ڕاگرن. دەیانگوت ئەم ســـروودە بێ نرخە کـــەی بایەخی ئەوەی هەیە کە تەنانەت چوار پێکانیش بیخوێننەوە.

هەر ئاژەڵێکیان لە کاتی خوێندنەوەی ســـروودەکە بگرتایە، هەر لەوێ دەیانخســـتە بەر دار و فەلاقە. هەرچەند کـــە بێدەنگیش نەدەبوون و هەر دەیانخوێندەوە. چۆلەکەکان لەســـەر پەرژینەکان ئاهەنگی سروودەکەیان بە جیکەجیک لێدەدا و کۆترەکانیش لە سەر دارەکان بە گمەگم دەیانخوێندەوە.

دەنگ و مۆسیقای سروودەکە، خۆی تێکەڵ بە دەنگی پیکی ئاسینگەرەکان و زەنگی کڵێسـەکان دەکرد و هـەرکات مرۆڤەکان گوێیان لێدەبوو بە بیر کردنەوە لە داهاتووی نگریسی خۆیان، سەر لەرزین دەکەوتن.

لە یەکێـک لە ڕۆژەکانی سـەرەتای مانگی ئۆکتۆبـەر، کاتێک دەغڵ دروابوونەوە و تەنانەت بەشێکیشـی گێرە کرابـوو، پۆلێک لە کۆترەکان لە ئاسـماندا سوڕێکیان دا و بە گمەگم نیشـتن. جۆنز و هەموو پیاوەکانی و هەروەها شـەش کەس لە مەزرای فاکس وود و پێنج فیلْدەوە، لە دەروازە پێنج شـەوژەنییەکەوە هاتبوونـە ژوورەوە و لە جادەی عەرەبانەکەوە بەرەو مەزراکـە دەهاتن. بێجگە لـە جۆنز کە لە پێشـەوە دەڕۆیی و تفەنگێکی بەدەسـتەوە بـوو، ئەوانیتر کوتەک و داریـان پێ بـوو. روون بوو کە بۆ ئەسـتاندنەوەی دووبارەی مەزراکە هاتبوون. زۆر لەمێژ بوو چاوەڕوانی ئەم رووداوە دەکرا و هەر بۆیەش هەموو ئامادەکارییەکی پێویست کرابوو.

سـنۆباڵ کە شەڕەکانی ژوول سزاری لە ڕووی نوسراوەیەکی کۆنەوە کە لە ماڵی جۆنز بوو خوێندبوونەوە، بەرپرسی پارێزگاری کردن لە مەزراکە بوو. خێرا فەرمانی پێویستی دەرکرد و هەموو ئاژەڵەکان لە ماوەی دوو خولەکدا لە شوێنی دیاریکراویان ئامادە بوون.

هەر کە مرۆڤەکان لە مەزراکە نزیک بوونەوە، سنۆباڵ یەکەمین هێرشی دەست پێکرد.

کۆترەکان کە سـەرجەمیان سی و پێنج دانە بوون بە سەر مرۆڤەکاندا فڕین و ڕیقنەیان کردە خوارەوە و هەر لەو کاتەشدا کە مرۆڤەکان خەریکی خاوێن کردنەوەی خۆیان بوون، مراویەکان کە لە پشت پەرژینەکەوە خۆیان حەشار دابوو هێرشیان کرد و ماسولکەی قاچی مرۆڤەکانیان بە هێزەوە دایە بەر دەنووک لێدان. لە ڕاستیدا ئەم بەشە بەس مانۆڕێکی بچوک بوو کە بۆ

دروست کردنی سەرلێشێوانێکی سەرەکی دارێژرابوو. مرۆڤەکان بە ئاسانی مراویەکانیان بە دار دوور خستەوە و لە پاشاندا سنۆباڵ هێرشی دووهەمی دەست پێکرد.

موریل و بنجامین و تێکڕای مەڕەکان لە کاتێکدا کە سنۆباڵ لە پێشیانەوە بوو هێرشیان کرد و لە هەموو لایەکەوە مرۆڤەکانیان دایە بەر لەقە و شاخ. بنجامین پشتی تێکردبوون و بە سمە چکۆلەکانی جووتەی دەهاویشت. ئەمجارەش خۆڕاگری مرۆڤەکان بە کەوشە بزمارڕێژکراو داردەستەکانیانەوە لە ئاژەڵەکان زیاتر بوو.

هەموو بە بیستنی نەعرەتەی سنۆباڵ کە بە مانای پاشەکشە بوو بەرەو حەوشەکە هەڵاتن.

مرۆڤەکان هاواری خۆشییان بەرز بووەوە و دوژمنیان لە کاتی پاشەکشە و هەڵاتندا دەدی و بە بێ وریایی دوایان کەوتن. ئەوە هەر ئەو شتەی بوو کە سنۆباڵ دەیهەویست. هەر کە مرۆڤەکان گەیشتنە ناوەڕاستی حەوشەکەوە سێ ئەسپ، سێ مانگا و هەموو بەرازەکان کە لە تەویلەکەدا کەمینیان گرتبوو، لە پشتەوە ڕێیان لە مرۆڤەکان گرت.

سنۆباڵ ئەمری هێرشی دەرکرد و بۆخۆی یەک ڕاست بەرەو جۆنز چوو. جۆنز چاوی کرد و تفەنگەکەی تەقاند. ساچمە پشتی سنۆباڵی ڕووشاند و مەڕێک کوژرا. سنۆباڵ بێ ڕاوەستان قورسایی جەستەی سەد کیلۆیی خۆی خستە سەر قاچی جۆنز. جۆنز لە سەر سەلوێنکە پەینەکە کەوت و تفەنگەکەی لە دەست پەڕی. لەوە ترسێنەرتر دیمەنی شەڕی باکسر بوو کە لە سەر دوو قاچەکانی دواوەی بەرز ببوەوە و بە سمە گەورە ناڵدارەکانی لە سەر و چاوی مرۆڤەکانی ئەدا.

یەکەم زەربەتی بەر سەری شاگرد مەیتەرێک کەوت کە وەک مردوو

لە ســـەر گڵەکە درێژ بوو. بە بینینی ئـــەم دیمەنە چەند کەس دارەکانیان فڕێدا و کەوتنە هەوڵی دۆزینەوەی ڕێگایەک بۆ دەرباز بوون. ترس بە سەر مرۆڤەکانـــدا زاڵ بوو و ئاژەڵەکانیش بە چوار قوڕنەی حەوشـــەکەیا هەڵیان دەبڕین. مرۆڤەکان شـــاخ و لەقەیان بەر دەکەوت. دەندووکیان لێدەگیرا. بە گاز بریندار دەبوون. لە هەمو حەوشـــەکەیا ئاژەڵێک نەبوو کە بە شـــێوەی خۆی تۆڵەیان لێ نەکاتەوە. تەنانەت پشـــیلەکەش لە ناکاو لە سەر بانەکەوە خۆی فڕێدایە سەر شـــانی چۆدارێک و نینۆکە تیژەکانی لە ملی توند کرد و هـــاواری لە چۆدارەکە بەرز کـــردەوە. هەر کە ڕێگایەکیـــان بۆ کرایەوە مرۆڤەکان وەک ئـــەوەی خوازیاری بووبن، لەو ڕێگایەی کە پێیدا هاتبوون بەرەو شـــار ڕایانکرد. بەمجۆرە پێنج خولەک لە هێرشـــەکەیان تێپەڕ نەبوو کە سووک و ترۆ پاشەکشەیان کرد. لە کاتێکدا کە مراوییەکان بە قیرەقیر دوایان دەکەوتن و دەندووکیان لە بازۆڵەکانی قاچیان دەگرت، بە شپرزەیی دوور کەوتنەوە.

هەموو مرۆڤەکان ڕۆیشـــتن، تەنیا یەکیان نەبێ. لە پشـــت حەوشەکە باکســـر هەوڵی ئەدا بە سمەکەی شاگرد مەیتەرەکە، کە بە ڕووەوە لە سەر گڵەکە کەوتبوو، وەری گێرێتەوە، بەڵام کوڕەکە جووڵەی نەکرد. باکســـر بە دڵگرانییەوە گوتی: «مردووە! من نەمدەویست ئەم کارە بکەم. بە تەواوی لە بیرم کردبوو کە ناڵی ئاســـنینم هەیە. کێ باوەڕ دەکا کە من ئەم کارەم بە ئەنقەست کردووە؟»

ســـنۆباڵ کە ئێســـتاش خوێن لە برینەکەی دەهات نەڕاندی و گوتی، «بەزەیی و دڵسۆزی پێویست ناکا هاوڕێ! شەڕ، شەڕە. بەس مرۆڤ مردووە! مرۆڤ باشە؟»

باکســـر لە کاتێکدا فرمێســـک بەر چاوی گرتبوو دووپاتی کردەوە: من

نامهەوێ گیانی هیچ کەس بستێنم، تەنانەت ئی مرۆڤ.

یەکێک لە ئاژەڵەکان بە سەرسوورِمانەوە گوتی ئەی مالی لە کوێیە؟

لە ڕاستیدا مالی دیار نەبوو. بۆ ساتێکی کورت ترس دایگرتن. ترسی ئەوە کە نەکا مرۆڤەکان بە جۆرێک زیانیان پێگەیاندبێ یاکوو لەگەڵ خۆیان بردبێتیان.

لە ئاکامدا مالی لە کاتێکدا کە سەری لە ژێر وێنجەی ناو ئاخورِەکە شاردبووەوە دۆزرایەوە. هەر لە کاتی تەقاندنی تفەنگەکە هەڵاتبوو. کاتێک ئاژەڵەکان دوای دۆزینەوەی مالی گەڕانەوە، بینییان کە شاگرد مەیتەر، کە لە ڕاستیدا بێهۆش ببوو، دوای هۆش هاتنەوەی بۆی دەرچووبوو.

ئاژەڵەکان بە شادی و خۆشی زۆرەوە دیسان لە یەک خڕبوونەوە. هەر کام بە دەنگی بەرز ئازایەتی و قارەمانیەتی خۆی لە مەیدانی شەڕەکەدا بۆ ئەوانیتر دەگێڕایەوە. بێ ڕاوەستان جێژنێک بە بۆنەی ئەم سەرکەوتنە گیرا. ئاڵا هەڵدرا و سروودی «ئاژەڵانی ئینگلیز» چەند جاران خوێندرایەوە. لە پاشاندا لاشەی مەڕە شەهیدەکە نێژرا و چقڵێک لە سەر مەزارەکەی داچێندرا.

سنۆباڵ لە سەر گۆڕەکەی وتارێکی کورتی خوێندەوە و لە سەر ئامادەیی و وریایی هەموو ئاژەڵەکان لە کاتی پێویستدا بۆ گیانبەخت کردن لە ڕێی قەڵای ئاژەڵەکان، چەند ساتێک دوا.

هەموو بڕیاریان دا کە نیشانێک بە ناو نیشانی «ئازایەتی ئاژەڵی پلەیەک» هەبێ کە هەر لەو کاتەدا، پێشکەش بە سنۆباڵ و باکسر کرا. نیشانەکە مەفرەغی بوو، کە لە بەرچاویلکە و زینی ئەسپەکان کرابووەوە. بڕیار درا کە نیشانەکە لە ڕۆژەکانی پشوو لە سەر سینگی باکسر و سنۆباڵ هەڵاوەسرێن.

نیشانی ئازایەتی ئاژەڵی پلە دوو، دروست کرا و پێشکەش بە مەڕە

شەهیدەکە کرا. لە سەر ناوی شەڕەکە لێکۆڵینەوەی زۆر کرا کە لە ئاکامدا بە هۆی ئەوەوە کە شـــەڕەکە لە گادانەکەوە دەستی پێکرد بە ناوی شەڕی گادان، ناوی لێندرا.

تفەنگەکەی جۆنز کە لە سەر گڵەکە کەوتبوو لەگەڵ فیشەکەکانی وەک دەســـکەوتێک لە ژێر داری ئاڵاکە دانرا و بڕیاریش درا ســـاڵی دوو جار بە تفەنگەکە تەقە بکەن، جارێک لە دوازدەی ئۆکتۆبەر ســـاڵڕۆژی شەڕەکە و یەک جاریش نیوەی هاوین ساڵڕۆژی ڕاپەڕینەکە.

□

## وەرزی ٥

هـــەر چەند لە زســـتان دەرۆیی مالی ڕۆژ لـــە دواڕۆژ دوورەپەرێزتر دەبوو. زۆربـــەی ڕۆژان بە بیانووی ئەوەی کـــە لە خەودا ماوەتەوە، درەنگ دەهات بۆ ئیـــش. لەگەڵ ئەوەی کـــە خواردنی باش بوو، بەڵام لە دەســـت ئیش و دەردی جۆراوجـــۆر دەینالانـــد. بەهۆکارێکی کەم بایەخەوە دەســـتی لە ئیش دەکێشـــایەوە و دەچووە لای ئەستێڵەئاوەکە و بە شێوەیەکی گەوجانە دەیڕوانییە وێنەکەی خۆی لە ناو ئاوەکەدا. قسە و باسی تازەش لە ئارادا بوو.

ڕۆژێک مالی بە لۆژەلۆژ لە ناو حەوشەکەدا دەگەڕا و بە کلکە درێژەکەی خـــۆی یاری دەکرد و لاســـقە وێنجەیەکـــی دەجوو. کلـــوور بانگی کردە قەراخێکـــەوە و گوتی: «مالی، شـــتێکی گرنگ هەیە کـــە دەبێ لەو بارەوە لەگەڵتا بدوێم».

ئەمڕۆ دەمەو بەیانی دیم کە تۆ دەتڕوانییە ئەودیوی پەرژینەکەی نێوان مەزراکـــەی ئێمە و فاکس وود، کە یەکێک لە پیاوەکانی پێل کێنگتن لەو دیوی پەرژینەکە وەســـتابوو. هەر چەندە کە نێوانم لە گەڵتا زۆر بوو، بەڵام

دڵنیام کە ئەو پیاوەم دی لە کاتێکدا لە گەڵ تۆ قسەی دەکرد. تەنانەت ئیزنت پێدا دەست بە لمبۆزتدا بهێنێ. مالی بۆ ئەم ئیشەت چ ڕوون کردنەوەیەکت هەیە بیڵێی؟

مالی لە کاتێکدا سمی لە عەرزەکە دەکوتا و بەملا و لادا هەڵی دەخستەوە گوتی: «دەستی لە لمبۆزی من دا؟! من هیچ کات کاری وام نەکردووە! ئەمە ڕاست نییە!» مالی! سەیری چاوی من بکە. سوێند دەخۆی کە ئەو پیاوە دەستی لە لمبۆزت نەدا؟» مالی دووپاتی کردەوە: «ڕاست نییە». بەڵام نەیتوانی سەیری چاوەکانی کلوور بکا و لە پاشاندا چوارناڵ بەرەو مەزراکە ڕۆیی.

بیرۆکەیەک بە مێشکی کلووردا هات و بێ ئەوەی بە کەسی بڵێ، چوو بۆ ئاخوڕەکەی مالی و بە سمەکانی ناو گیاکە گەڕا. چەند کلۆ قەند و چەند ڕوبانی هەمەڕەنگی دی کە داشاردرابوون. پاش سێ ڕۆژ مالی ون بوو و تا چەند حەوتەش کەس هەواڵێکی لە شوێنەکەی نەبوو. تا ئەوەی کۆترەکان ڕاپۆرتیان دا کە ئەویان لەو لای ولینگدن لە بەردەم مەیخانەیەکدا دیوە کە لە نێوان ماڵبەندی عارەبانەیەکی سوور و ڕەشدا وەستاوە و پیاوێکی سووری قەڵەو کە شەڵوارێکی ڕەنگ بۆری لە پێدایە و لە میواندارەکان دەچوو، دەستی بە لمبۆزی مالیدا دەهێنا و کلۆ قەندی بەش ئەدا. تازە ڕنەک کراوە و ڕوبانێکی ڕەنگ بەنەوشی بە یالیەوە بەستووە. کۆترەکان دەیانگوت لە ڕواڵەتی دیار بوو کە لەو بارودۆخەی کە تێیدایە شادمانە. لەوە بە دوا ئاژەڵەکان ناوی مالییان نەبرد.

لە ژانوییەدا زۆری سارد کرد. زەوی ناو مەزراکە وەک بەرد ڕەق ببوو. هیچ ئیشێکی لێ نەدەکرا. کۆبوونەوەی جۆراوجۆر لە تەویلەکەدا پێک دەهاتن و بەرازەکان خەریکی داڕشتنی پلانی ئیش و کاری وەرزی داهاتوو

بوون. پەسەند کرابوو کە بەرازەکان، کە بە ڕوونی لە ئاژەڵەکانیتر زیرەکتر بوون، هەموو بڕیارەکانی شێوەی ئیشی مەزراکە بدەن، هەر بۆیەش بە زۆرینەی دەنگەوە ئەو بڕیارانەی لە لای ئەوانەوە دەدران پەسەند دەکران.

ئەگەر مشت و مڕ و دەمەقاڵەی نێوان سنۆباڵ و ناپلیۆن نەبوایە ئەم شێوازە ڕێک و پێک بوو، بەڵام ئەم دووانە هەر کاتیان بۆ بڕەخسایە ئەوە دژایەتی یەکتریان دەکرد. کاتێک یەکیان دەیگوت با جۆ زیاتر بەرهەم بێنین، ئەوی دیکەیان دەیگوت با هەرزن زیاتر بەرهەم بێنین. هەر کات یەکیان دەیگوت ئەم پارچە زەوییە بۆ کەلەم باشە ئەوی دیکەیان بە پێچەوانەی ئەو ڕای لە سەر چەوەندەر بوو. هەر کامیش لایەنگری خۆیان هەبوو کە جاری وابوو مشت و مڕ دەگەیشتە ئەو پەڕی توندی خۆی. لە کۆبوونەوەکاندا زیاتر سنۆباڵ زۆرینەی دەنگی بە دەست دەهێنا، ئاخر لە ڕاستیدا ئەو بە گفت و لفت و قسەزانی باش بوو. بەڵام ناپلیۆن لە دەرەوەی کۆبوونەوەکاندا سەرکەوتووتر بوو. بە تایبەت لە ناو مەڕەکاندا بە باشی تەشەنەی کردبوو. لەم دواییانەدا مەڕەکان فێر ببوون بە باڕەباڕ «چوار پێ باش و دوو پێ خراپ»یان وەخت و ناوەخت دەگوتەوە و کۆبوونەوەکانیان دەشێواند. بەتایبەت لە کاتە ناسکەکانی قسە و باسەکانی سنۆباڵ زیاتر باڕەباڕی «چوار پێ باش و دوو پێ خراپ» بەرز دەبووەوە. سنۆباڵ چەند ژمارەی کۆنی گۆڤاری «جووتیار و ئاژەڵداری» بە وردی خوێندبوونەوە کە پڕ بوون لە گەڵاڵە بۆ پەرە پێدان و ئاوەدان کردنەوەی مەزرا. لە سەر کێڵان و چۆنیەتی بەرهەم هێنان بە باشی دەدوا و بۆ دەست پێوە گرتن لە کاتدا پلانێکی دژواری داڕشتبوو. بە پێی ئەو پلانە ئاژەڵەکان هەر ڕۆژ پاشەڕۆی خۆیان لە شوێنێکی دیاریکراوی ناو مەزراکەدا دەڕشت. ناپلیۆن مێشکی بە لای ئەمانەدا نەدەچوو بەس بە هێمنی و لە سەرخۆ دەیگوت چاوەڕێی

کاتێکی باشـــم. هیچ کام لە کێشەکانی ئەوان بە توندی ئەو کێشەیە نەبوو کە لە سەر ئاشەباکە لە نێوانیاندا پەیدا ببوو.

لە شـــوێنێکی لەوەڕگەکەدا کە لە خانووبەرەی نـــاو مەزراکە زۆر دوور نەبوو، لە ســـەر تەپۆڵکەیەک کە بەرزترین شـــوێنی مەزراکە بوو و سنۆباڵ دوای لێکۆڵینەوەیەکی زۆر ڕایگەیاندبوو کە ئەم شـــوێنە بۆ دروست کردنی ئاشیبا شوێنێکی گونجاوە و دەتوانین بەم کارە بە مەزراکەمان وزەی کارەبا ببەخشـــین و ئاخوڕەکانمان گەرم و ڕووناک بکەین و مشـــاری میکانیکی، ماشـــینی گێرە کردن و چەوەندەر چنین، ئامێری کارەبایی شیر دۆشین و زۆر شـــتی ترمان هەبێت. ئاژەڵەکانی مەزراکە لە ســـەر ئەم شتانە هیچیان نەدەزانی و نەیانبیستبو (مەزراکە کۆن بوو و بەس ئامێری سەرەکی و کۆنی بوو) و بە سەرســـووڕمانەوە گوێیان گرتبوو. ســـنۆباڵیش کۆمەڵێک وێنەی ئەو ئامێرە ســـەیرانەی بۆ هێنابوون کە ئیشـــەکانیان بۆ دەکا و دەتوانن بە کەیفـــی خۆیان بلەوەڕێن و بە خوێندنەوە و گێڕانەوەی بەســـەرهاتەکانیان ڕادەی زانیاریان ببەنە ســـەرەوە. نەخشەکانی سنۆباڵ بۆ ئاشەکە لە ماوەی چەنـــد حەوتەدا تەواو بـــوون. زانیارییە میکانیکییەکان لە ســـێ کتێب بە ناوەکانی، هەزار ئیشی باشی پێوەندیدار بە ماڵەوە، هەموو دەتوانن ئەندازیار و وەســـتا بن و کارەبا بۆ هەمووان، کە هی ئاغای جۆنز بوون، وەرگیرابوون. ســـنۆباڵ ئەو هۆدەیەی کە کاتی خۆی شوێنی ماشینەکانی مریشک بەخێو کردن بوون و رووپەرێکی داری تەختی هەبوو و بۆ نەخشـــە کێشـــانەوە بە کەڵـــک بوو، کردی بە شـــوێنی کاری خۆی. زۆر جار بـــۆ ماوەیەکی درێژ کتێبەکانی بە پارچە بەردێک بە کراوەیی دەهێشـــتەوە و تەڵزمە گەچێکی لە نێوان ســـمەکانی دەگرت و دەرگای لە خۆی دادەخست و بەخێرایی لە سووچێکەوە بۆ ســـووچێکیتر دەڕۆیی و خەت بەدوای خەتدا دەیکێشانەوە

و لە خۆشـــیان دەیفیشکاند و دەنگی سەیر سەیری لە خۆی دەردەهێنان. نەخشـــەکە وردەوردە بە شێوەی خەتی تێکەڵ و پێکەڵ، ماشین و پەڕەی ئاشـــەکەی تا ڕادەیەک نیشـــان دەدا و ڕووبەری ناو دیوەکەی دادەپۆشی. ئـــەم خەتانە بـــۆ ئاژەڵەکانیتر ڕوون نەبوون کە چین، بـــەڵام دەبووە هۆی سەرســـوورمانیان. هەموو بۆ بینینی نەخشـــەکانی سنۆباڵ بە لانی کەمەوە ڕۆژی جارێـــک ســـەردانی هۆدەکەیان دەکرد. تەنانەت مریشـــک و قاز و مراوییەکانیـــش دەهاتن و زۆر بە وریاییـــەوە هەنگاویان دەنا بۆ ئەوەی قاچ نەخەنە ســـەر شوێنەواری گەچەکە. تەنانەت ناپلیۆنیش کە لە سەرەتاوە لە گەڵ ئەم کارە دژایەتی دەکرد و خۆی تەریک گرتبوو، کوتوپڕ ڕۆژێک بۆ بینینی نەخشـــەکان چوو. بە هێواشـــی و وردی بە دەوری هۆدەکەدا گەڕا. هەموو وردەکارییەکانی لە نزیکەوە ســـەیر کرد و دوو هێندەی جارانی بۆن پێوە کردن و پاشـــان زۆر پەرۆشـــانە لە سیلە چاوەوە تێی‌ڕوانین و لە ناکاو قاچی بەرز کردەوە و میزی کرد بە سەر نەخشەکاندا و بە بێ‌دەنگی چووە دەرەوە.

لە بابەت ئاشەکەوە دانیشتوانی قەڵاکە ببوون بە دوو بەشی جیاواز. سنۆباڵ نەیدەشاردەوە کە دروست کردنی ئاشەکە ئیشێکی گرانە، چون بۆ بەرز کردنەوەی دیوارەکە پێویســـتیان بە دەرهێنانی بەرد بوو. پاشـــان دەبوایە بادەوانەکەی دروســـت کرایە، تازە پێویستی بە دینام و سیم هەبوو. (لە بابەت چۆنییەتی بە دەســـت هێنانی ئەم کەرەســـتانە سنۆباڵ هیچی نەدەگوت).

بەڵام بڕوای وابوو کە ئیشـــەکە لە ماوەی ساڵێکدا تەواو دەبێ. هەروەها بـــڕوای وابوو کە لە پاش تەواو بوونی ئاشـــەکە کاتی بێکاری تا ئەو ڕادەیە زۆر دەبـــێ کـــە ئاژەڵەکان تەنیا ســـێ ڕۆژ لە حەفتەدا ئیشـــیان دەبێ. لە

لایەکیترەوە ناپلیۆن دەیهەویســـت بیسەلمێنیٚ کە سەرەکیترین پێویستی ڕۆژ، زۆر کردنـــی بەروبوومە. هەر بۆیەش ئەگەر ئاژەڵەکان کاتی خۆیان بۆ دروســـت کردنی ئاشـــەکە بە فیڕۆ بدەن ئەوە لە برساندا دەمرن. ئاژەڵەکان بە دوو دەستە و دوو دروشمی جیاوازەوە دابەش ببوون. یەکیان بە سنۆباڵ و ســـیٚ ڕۆژ ئیش لە حەوتەدا دەنگ بـــدەن و ئەوی دیکەیان بە ناپلیۆن و خواردنـــی زۆرتر دەنگ بدەن. بەس بنجامین بیٚ لایەن بوو. نە باوەڕی بوو خواردن زۆرتر دەبیٚ و نە باوەڕیشی بەوە بوو کە ئاشەکە دەبێتە هۆی کەم بوونـــەوەی ڕادەی ئیش. دەیگوت: چ ئاش هەبـــیٚ و چ نەبیٚ ژیانی ئێوەی ئاژەڵ وەک پێشوو قەشمەجاڕی دەبیٚ.

سەرەڕای کێشەی ئاشـــە بابیەکە، پاراستنی مەزراکەش گرنگ و جێی بـــاس و لێکۆڵینەوە بـــوو. هەر چەند کە مرۆڤەکان لە شـــەڕی گادانەکەدا تێکشکابوون، بەڵام ڕوون بوو کە ئەوان جارێکیتر و بەهێزتر و پڕچەکتر لە جاری پێشووو بۆ گرتنەوەی مەزراکە و گێڕانەوەی جۆنز هێرش دەکەنەوە. بە تایبەت بەم هۆیەوە کە شکانی جۆنز لە هەموو دەور و بەرەکەدا دەنگی دابـــووەوە و ئاژەڵی دراوســـێکانی یاخی کردبوو، مرۆڤـــەکان ناچار دەبوایە دیسان هێرشیان بکردایەتەوە. سنۆباڵ و ناپلیۆن وەک جاران لەم مەترسییە گرنگەشـــدا یەکدەنگ نەبوون. ناپلیۆن دەیگوت دەبـــیٚ چەکی ئاگریمان هەبیٚ و شێوەی بەکارهێنانی فێر ببین و سنۆباڵیش دەیگوت دەبیٚ کۆتری زیاتر بۆ دەرەوەی مەزراکە بنێرین بۆ ئەوەی ڕاپەڕینەکە لە ناو ئاژەڵەکانیتر دەنگ بداتەوە. ئەویان بۆ سەلماندنی باوەڕەکەی دەیگوت ئەگەر ئاژەڵەکان توانایی خۆپاراســـتیان نەبیٚ، ئەوە تێکدەشـــکێن و لە نـــاو دەچن. ئەمیان دەیگوت ئەگەر لە مەزراکانی دەور و بەریشـــدا ڕاپەڕین سەر هەڵبدا، ئەوان پێویســـتییان بە خۆپاراســـتن نییە. ئاژەڵەکان لە ســـەرەتادا گوێیان دابووە

ناپلیۆن و دواییش ســـنۆباڵ، بەڵام نەیاندەتوانی بزانن کام باوەڕەیان ڕاستە. لە ڕاستیدا هەر کامیان قسەی دەکرد، هاودەنگی ئەو دەبوون.

پاش ئەوەی کە نەخشـــەکانی ســـنۆباڵ تەواو بوون، بڕیـــار درا کە لە کۆبوونەوەکەی ڕۆژی یەکشـــەممەی داهاتوودا باس لە دروســـت کردن و نەکردنی ئاشەکە بکەن. کاتێک ئاژەڵەکان لە تەویلەکەدا کۆبوونەوە، سنۆباڵ هەستایە ســـەر پێ و هەر چەند جاربەجار قسەکانی بە بارەبارِی مەڕەکان دەبڕان، هۆکارەکانی دروست کردنی ئاشەکەی بۆ ئاژەڵەکان ڕوون کردەوە. پاشـــان ناپلیۆن بۆ بەرپەرچ دانەوە، هەستا و لەو پەڕی هێمنیدا گوتی کە ئاشـــی با شتێکی بێ کەڵکە و کەســـیش دەنگ نەدا بە دروست کردنی، و بە پەلە دانیشت.

ماوەی قســـەکانی لە ســـی چرکە تێپەڕ نەبوو و واشـــی نیشان ئەدا بۆ کاریگەربوونی قسەکانی بایەخێک دانانێ.

سنۆباڵ هەستا و پاش گوڕاندنی بە سەر مەڕەکاندا کە دیسان بارەبارِیان دەکرد، تیر و تەســـەل لە سەر ئاشـــەکە دوا. تا ئەم کاتەش ئاژەڵەکان دوو دەستە بوون، بەڵام پاش قسەکانی سنۆباڵ کە لەو پەڕی قسەزانیدا گوتران، ئـــەم بارودۆخەی بەلای خۆیدا گۆڕی. بەو گوتە شـــیرین و وردانەی خۆی ئەو ڕۆژانەی هێنایە بەر چاوی ئاژەڵەکان کە ئیشـــە بچووک و بێ مایەکان شـــانی ئاژەڵەکان ناگرن. باســـەکەی لە ئامێری گێـــرە و چەوەندەر چنین بەولاتـــر بردبوو. دەیگوت وزەی کارەبا دەتوانێ ئامێری شـــەن کردن بخاتە گـــەڕەوە و زەوی بکێڵێتەوە. گڵمەتەکان ورد بکا و هەموار کردنی زەوییەکە و دروێنەشیان لە کۆڵ بخاتەوە. سەرەڕای ئەمانەش لە ئاخوڕەکاندا ڕووناکی، ئاوی سارد و گەرم و ئامێری گەرم کردنەوە بوونیان دەبێت.

کاتێک قســـەکانی تەواو بوو، چیتر گومانی تێـــدا نەمابوو کە زۆرینەی

دەنگەکانی بە لای خۆیدا گێڕاوەتەوە. بەڵام لەم کاتەدا ناپلیۆن هەستا و بە سـیلە چاوەوە سەیرێکی سنۆباڵی کرد و دەنگێکی تایبەتی لێبووەوە کە تا ئەو کاتە کەس لێی نەبیستبوو.

بە هۆی ئەم دەنگەی ناپلیۆنەوە، حەوتەحەوتێکی ترسـێنەر لە دەرەوە بیسـترا و نۆ سـەگی زل کـە ملوانکەی نەخش کوتیان لـە ملدا بوو، بە هەڵادان هاتنە ناو عەممارەکەوە و یەکەوڕاست هێرشیان بردە سەر سنۆباڵ. گەر سـنۆباڵ تۆزێک درەنگ بجووڵایەتەوە، ئەوا ورگیان دەدڕی. ماوەیەک دوای ئەوە سـنۆباڵ لە دەرەوە بوو و سەگەکانیش بە دوایدا. ئاژەڵەکان کە لە ترسان زمانیان لەگۆ چووبوو، تێکڕا لە پێش دەرگاکەدا کۆ بوونەوە و بە سەرسووڕمانەوە سەیری سنۆباڵ و سەگەکانیان دەکرد.

سـنۆباڵ لە سەر شـینکەکە بەرەو جادەکە ڕای دەکرد. تەنها بەرازێک دەیتوانی بەو جۆرە ڕا بکا، بەڵام سەگەکانیش دور و نزیک بەدوایەوە بوون کـە لە کتوپڕدا سـنۆباڵ قاچی خزا. هەموو وایـان دەزانی کە گیرا، بەڵام هەسـتایەوە و بە گورجی دەسـتی بە هەڵاتن کردەوە. سەگەکان دیسان خەریک بوو تەواو لێی نزیک دەبوونەوە، تەنانەت یەکیان گازێکی لە کلکی گرت، بەڵام بە تەکانێک خۆی ڕافسـکاند و لـەو کاتەدا کە تۆزێکی مابوو سـەگەکان پێی بگەن، بە هەموو هێز و توانایەوە خۆی بە شـەقارێکی ناو پەرژینەکەدا کرد و ئیتر لە چاو ون بوو.

ئاژەڵەکان بە ترس و بێدەنگیەوە گەڕانەوە ناو تەویلەکە. دوای ماوەیەکی کورت سەگەکان بە فڕکەفڕک هاتنە ژوورەوە. جارێ کەسیان نەیدەزانی ئەم سـەگانە لە کوێوە هاتوون و چۆن پەیدا بوون، بەڵام هەر زوو بۆیان ئاشکرا بـوو کە ئەمانە هەر ئەو توتکانەن کە ناپلیۆن لە دایکەکانیانی سـتاندبوو و بـۆ خۆی بەخێـوی کردبوون. هەر چەند کە هێشـتا کامڵ نەبوون، بەڵام

قەڵافەتێکی زل و دڕندانەیان هەبوو. هەموو لە نزیک ناپلیۆنەوە وەستان و کلکیان بۆ هەڵدەسووڕاند. ئاژەڵەکان بینیان کە ئەوان بە جۆرێک کلکیان بۆ ناپلیۆن هەڵدەسووڕاند کە پێشتر سەگەکان بۆ جۆنزیان دەجووڵاند. لەکاتێکدا سەگەکان بە دوای ناپلیۆنەوە بوون، چووە سەر ئەو سەکۆیەی کە پێشتر مێجر لە سەری وەستابوو و ڕاوەستا و گوتی: «لەم ڕێکەوتە بەدواوە کۆبوونەوەکان بەیانیانی یەکشەممە پێک نایەن. هۆکارەکەشی ئەمەیە کە بێ کەڵکن و دەبنە هۆی بەفیڕۆ چوونی کات. لە داهاتوودا هەموو ئاریشەی مەزراکە لە لێژنەیەکی تایبەت کە پێک دێ لە بەرازەکان بە سەرپەرشتی خۆم، دەکەونە بەر باس و لێکۆڵینەوە. کۆبوونەوەکان لە هەموو ئاژەڵەکان پێکنایەن، بەس شتە گرنگەکانتان پێ ڕادەگەیەنن. کۆبوونەوەی بەیانیانی یەکشەممە بۆ ڕێزگرتن لە ئاڵاکە و خوێندنەوەی سروودی ئاژەڵانی ئینگلیز و وەرگرتنی فەرمانە تازەکان وەک پێشووو بەردەوام دەبێ. بەڵام لە ئەمڕۆ بە دواوە باس و لێکۆڵینەوە بۆ ئێوە نامێنێ».

ئاژەڵەکان کە ئێستاش تەزیوی شێوەی هەڵاتنی سنۆباڵیان لە لەشدا مابوو، بەم ئامۆژگاری و وریا کردنەوانە بە تەواوی خۆیان دۆڕاندبوو. چەند تاکێکیان کە دەیانتوانی ڕێگایەکی دروست بۆ باس کردن لە هۆکارەکان وەدۆزن، ویستیان ناڕەزایەتی خۆیان دەربڕن. تەنانەت باکسر بە شێوەیەکی سەیر دڵگران بوو و گوێکانی تەپ کردن و چەند جاران یاڵیەکانی ڕاوەشاندن. زۆری هەوڵدا کە خۆی هێمن بکاتەوە و شتێک بڵێ، بەڵام نەیتوانی شتێک بۆ گوتن بدۆزێتەوە.

تەنانەت لەناو چەندێک لە بەرازەکان دەنگی ناڕەزایەتی بەرز بووەوە. چوار بزەڵە بەرازی گۆشتن کە لە ڕیزی پێشەوە بوون بە نیشانەی ناڕەزایەتی پێکەوە هەستان و دەستیان کرد بە قسە کردن لەگەڵ یەکتر، بەڵام لە

ناکاو سەگەکان کە لە دەور و پشتی ناپلیۆن وەستابوون مرەیەکی شێوە هەڕەشەیان لێهات و بەرازەکانیان بێدەنگ کرد و لە جێی خۆیاندا دایان نیشاندنەوە. پاشان بارەباری «چوارپێ باش و دوو پێ خراپ»ی مەڕەکان بۆ ماوەی چارەکە وەختێک توانی ڕێی هەموو چەشنە قسە و باسێک بگرێ. سکوئیلەر فەرمانی پێدرا کە بە مەزراکەدا بگەڕێ و یاسای نوێ بە هەمووان ڕابگەیەنێ.

سکوئیلەر گوتی: «هاوڕێیان من بیر و باوەڕم وایە کە هەموو ئاژەڵەکانی ناو ئەم مەزرایە لە فیداکاری و لە خۆ بردوویی هاوڕێ ناپلیۆن کە ئێستا ئەرکێکی زۆرتر و قورستری لە ئەستۆیە، ئاگادارن و بە شایەنی ڕێزی دەزانن. هاوڕێیان وا بیر مەکەنەوە کە پێشەوا بوون خۆشە! بە پێچەوانەوە ئەرکێکە زۆر قورس و پڕ لە بەرپرسیارییەتی. هیچ کەس بەڕادەی هاوڕێ ناپلیۆن بڕوای بە یەکسانی نێوان ئاژەڵان نییە. ئەو بەش بە حاڵی خۆی زۆری پێخۆش دەبوو کە یەکێک لە ئێوەی بکردایە بە بەرپرسی کار و باری خۆتان، بەڵام لەوە دەترسێ کە نەکا بە هەڵە بڕیارێک بدەن. یاکوو ئیشێکی نابەجێ بکەن. یان وای دانێن کە ئێوە متمانەتان بە خەیاڵ پڵاوەکانی سنۆباڵ هەبێ! ئەو سنۆباڵەی کە هەموو دەزانین کە هیچی وای لە خائینێک کەمتر نییە، ئەی چیمان بەسەر دێت؟» یەکێک گوتی: «ئەو لە شەڕی گادانەکەدا زۆر دلێرانە شەڕی کرد».

سکوئیلەر گوتی: «ئازایەتی بەس نییە. ئەوەی کە بایەخدارە ئەرکناسی و ئەمەک زانییە. لە بابەت شەڕی گادانەکەشەوە دەبێ بڵێم ڕۆژێک دێت کە هەموو بزانن ئەوانەی لە بارەی سنۆباڵەوە گوتراوە و دەگوترێن لە ڕاستییەوە دوورن. دروشمی ئەمڕۆی ئێمە پۆڵایە. هەنگاوێکی بە هەڵە هەڵهێنانەوە دەبێتە هۆی زاڵ بوونی دوژمنان بە سەرماندا. خۆ هاوڕێیان ئێوە خوازیاری

گەڕانەوەی جۆنز نین؟»

جارێکیتریش ئەم باســـە بێ وەڵام مایەوە. لە ڕاســـتیدا ئاژەڵەکان هیچ حەزیان بە گەڕانەوەی جۆنز نەدەکرد.

هەر کات یەکشـــەممانە لـــە کۆبوونەوەکاندا باســـی گەڕانەوەی جۆنز دەکرا، ئەوە هەموو باســـەکان دەوەستان. باکســـر کە تا ئەم کاتە مەجالی ئەوەی هەبووە کە بیر و بۆچوونەکانی ڕاســـت بکاتەوە و یەکیان بێنێتەوە، بە نوێنەرایەتی لە لایەن هەســـت و ویســـتی ئاژەڵەکانـــەوە گوتی: «ئەگەر هاوڕێمان ناپلیۆن ئەمەی گوتووە ئەوە ڕاســـتە». لەم ڕێکەوتە بەولاوە باکسر دروشمی «هەموو کات وتەکانی ناپلیۆن ڕاستن»ی بە دروشمی تاکە کەسی خۆی واتە «من زیاتر ئیش دەکەم» زیاد کرد.

وەرزی ســـەرما، ئەو هێز و توانایەی نەمابوو. کاتی دەغڵ و دان چاندن بـــوو. دەرگای ئەو هۆدەی کە ســـنۆباڵ نەخشـــەکانی تێدا دەکێشـــایەوە، داخرابوو. واشـــیان نیشـــان دەدا کە هەموو ئەو نەخشانەی سەر عەرزەکە پاک بوونەتەوە.

لە کاتژمێر «دە»ی ســـەر لە بەیانی هەموو یەکشەممەیەکدا، ئاژەڵەکان بۆ وەرگرتنی فەرمانی تازە کۆ دەبوونەوە. ئێسکەســـەری مێجری پیریان لە گۆڕەکەی لای باخەکە دەرهێنابووەوە و لە سەر کۆتە دارێکی بن ئاڵاکە، لە پەنـــای تفەنگەکەدا دایاننابوو. واش بڕیار درابوو کە دوای ِهەڵکردنی ئاڵاکە ئاژەڵـــەکان پێش چوونە ژوورەوە بۆ نـــاو عەممارە گەورەکە بەڕێزەوە لە بەر دەمیا ڕێژە بڕۆن.

ئێســـتا ئاژەڵەکان وەک جاران بە دەوری یەکدا کۆ نەدەبوونەوە. ناپلیۆن و ســـکوئیلەر و بەرازێکیتر بە نـــاوی «مینی ماس» کە لە دانانی ئاهەنگ و شێعر هەستێکی باشی هەبوو لە سەر سەکۆکە دادەنیشتن و نۆ سەگەکەش

بە شێوەی نیوە ئاڵقەیەک لە پشتیانەوە دەوەستان.

بەرازەکانیتریش لە پشت سەریانەوە جێگیر دەبوون. ئاژەڵەکانیش لە بەر دەمیاندا و لە ناوەڕاستی عەممارەکە دادەنیشتن. ناپلیۆن فەرمانەکانی بە دەنگێکی نێر و سەربازانە دەخوێندەوە و ئامادەبوانیش دوای جارێک خوێندنەوەی سروودی ئاژەڵەکانی ئینگلیز بڵاوەیان دەکرد. لە سێهەمین یەکشەممەی دوای دەرکردنی سنۆباڵ، ئاژەڵەکان لەوپەڕی سەرسووڕمانەوە، لە ناپلیۆنیان بیست کە گوتی ئاشە باکە دروست دەکرێ! ئەو لە مەڕ هۆی گۆڕانی بڕیارەکە باسێکی نەکرد. تەنیا بە ئاژەڵەکانی گوت کە ئەم ئیشە کاری زۆری دەوێ و لەوانەشە ببێتە هۆی کەم بوونەوەی جیرەکەیان. ئەمەشی گوت کە نەخشەی ئاشەکە بە هەموو وردەکاریەکانییەوە لە لایەن لێژنەیەکی تایبەت لە بەرازەکان کێشراوەتەوە و هیوایە کە کاری دروست کردنی لە ماوەی دوو ساڵدا تەواو ببێ.

هەر ئەو ڕۆژە عەسر سکوئیلەر بە شێوەی تاکە کەسی بە ئاژەڵەکانی دەگوت کە لە ڕاستیدا ناپلیۆن هیچ کات لەگەڵ دروست کردنی ئاشەکە دژایەتی نەبووە، بەڵکو هەر لە سەرەتاوە لایەنگری بووە. ئەو نەخشەی کە سنۆباڵ لە تەختایی هۆدەکەیا کێشابوویەوە، لە ڕاستیدا لە ناو نووسراوەکانی ناپلیۆن دزرابوون، بۆیەش دەبێ هەموو بزانین ئاشی با لە دەسکەوتەکانی ناپلیۆنە. کاتێک کە یەکێک لە ئاژەڵەکان پرسیاری کرد، ئەی بۆ ناپلیۆن ئاوا کەللەڕەقانە دژایەتی دەکرد، سکوئیلەر سیلە چاوێکی دایە و گوتی: «ئەوە زیرەکی ناپلیۆن بوو. بەس وای نیشان دەدا کە دژی دروست بوونی ئاشەکەیە، بۆ ئەوەی لە قڕەی سنۆباڵ کە کەسێکی مەترسیدار بوو، ڕزگاری ببێت و ئێستاش کە سنۆباڵ لە سەر ڕێ هەڵگیراوە، نەخشە بێ دەست تێوەردان و خۆ تێهەڵقورتانی ئەو، دەتوانرێ جێبەجێ بکرێ». هەروەها

سکوئیلەر گوتی: «ئەمە هەر ئەو شتەیە کە پێی دەڵێن تاکتیک». لە کاتێکدا کـــە هەڵدەخولا و کلکی هەڵدەســـووڕاند، چەند جـــاران دووپاتی کردەوە «تاکتیک، هاوڕێیان تاکتیک!»

ئاژەڵەکان بە ڕوونی لە مانای وشـــەکە تێنەگەیشتن بەڵام سکوئیلەر بە جۆرێک قســـەی دەکرد و سەگەکانیش بە جۆرێک دەیانمڕاند کە هەمووی قسەکانی بێ «سێ و دوو» وەرگیران.

□

## وەرزی ٦

سەرانسەری ئەو ســـاڵە، ئاژەڵەکان وەک کارەکەرێک ئیشیان دەکرد، بەڵام هەر ڕازی بوون و لە هیچ چەشـــنە تێکۆشـــان و لە خۆبردووییەک خۆیان نەبان نەدەکرد. ئەوان باش دەیانزانی هەر چەندە تێکۆشـــن لە بەرژەوەندی خۆیان و نەوەی داهاتوویانە، نەک بە سوودی پۆلێک مرۆڤی دز و کارنەکەر.

لە هەموو وەرزەکانی بەهار و هاویندا حەفتەی شەست کاتژمێر ئیشیان کرد و لـــە مانگی «ئووت» (ئـــاب)دا ناپلیۆن ڕایگەیاند کـــە دوانیوەڕۆیانی یەکشـــەممەش کار هەیە. ئەم کارە خۆویســـتییە، بـــەڵام ئەگەر ئاژەڵێک دواکەوێ، یا خۆی وەدزێ، ئەوە بەشـــی خواردنی نیوە دەکرێ. ســـەرەڕای ئەمانەش لە زۆربەی ئیشـــەکان چاوپۆشـــی کرا. غەلە و خەرمان بەڕادەی ساڵی پێشووو کۆ نەبووەوە. دوو زەوییە چەوەندەرەکەش بە هۆی ئەوەوە کە لە کاتی خۆیـــدا نەکێڵدرابوون، دانەچێندران. هەر بۆیەش چاوەڕوان دەکرا زستانی داهاتوو زستانێکی سەخڵەت و پڕ لە کۆسپ بێ.

ئاشەکە لە گەڵ گرفتی چاوەڕوان نەکراو ڕووبەڕوو دەبووەوە. هەر لە ناو

مەزراکەدا بەرد و ئاهەک و زیخ و سـیمانی پێشـوووی لێبوو. بە واتایەکی دیکە هەموو کەرستەی پێویست هەبوون، بەڵام ئەو کێشەیەی کە ئاژەڵەکان لە سـەرەتاوە نەیانتوانیبوو ڕێگا چارەیەکی بۆ وەبینن، شـکاندنی بەرد بە قەبارەی جۆراوجۆر و پێویسـت بوو. واش دەزانرا کە تەنیا ڕێی شـکاندنی بـەردەکان، بەکارهێنانی پیک و نوێڵ بوو، کە ئەم کارەش بە هیچ کام لە ئاژەڵەکان نەدەکرا لە بەر ئەوەی نەیاندەتوانی لەسەر دوو پێ بوەستن. دوای تێپەڕ بوونـی چەند حەفتە، یەکێک لە ئاژەڵەکان ڕێگا چارەیەکی باشـی دۆزیەوە. وا بڕیار درا لە هێزی کێشـانی زەوی کەڵک وەرگرن. بە دەوری ئەو بەردانەی کە زل و بەکار نەهاتوو بون، گووش و گوریسیان دەهاڵاند و بە هاوکاری هەموو ئاژەڵەکان تەنانەت لە زۆر کاتی ئاستەمدا بەرازەکانیش، ئەیانبردنە سەر تەپۆڵکە و بەرزاییەکان. لەوێوە گلیان دەکردنەوە بۆ خوارەوە تا ورد بوونایە. ئەو کات ورد و پردەکەی دەگوێزرایەوە بۆ سەر کارەکە.

ئەسـپەکان لەتە بەردەکانیان لە گارییەکان دەخسـت و ڕایاندەکێشا و مەڕەکانیش وردەکانیان دەبرد.

تەنانەت موریل و بنجامینیش خۆیان لە گارییەک بەستبوو و بەشداری کارەکەیـان دەکرد. لە ئاخری هاویندا بڕێک بـەرد کە تا ڕادەیەک بەس بوون، کۆکرانەوە و دروستکردنی ئاشەکە بە سەرپەرشتی بەرازەکان دەستی پێکرد.

بەڵام ئیشـەکان پێشکەوتنی بەرچاویان نەبوو. جاری وابوو یەک ڕۆژی تـەواو بە بردنە سـەرەوەی بەردێک خەریک دەبـوون. زۆر جارانیش ئەو بەردانەی کە گل دەکرانەوە، نەدەشکان و کاری دوبارەکاری دەهاتە بەر.

هیچ ئیشـێک بێ باکسـر کە هێزەکـەی بە تەنیا بـە ڕادەی هێزی ئاژەڵەکانیتر بوو، نەدەکرا.

ئەو کاتەی بەردێک دەخزا و ئاژەڵەکان بۆ ئەوەی کە لە گەڵیا دانەکشێنە خوارەوە ڕایان دەکرد و بە دڵساردیەوە داد و هاواریان دەکرد، ئەوە باکسر بوو کە خۆی لە بەر گووش و گوریس و قورسایی بەردەکەدا دەگرت. بینینی جەستەی لەو کاتانەدا کە بست بە بست داوێنەکەی بەرەوسەر دەبڕی و هەسکەهەسکی بوو و بە نووکی سمەکانی عەرزەکەی دەکۆڵی و کەفەڵەکانی لە ئارەقەدا شەلاڵ دەبوون، دیمەنێکی وای دەخولقاند کە دەبووە هۆی سەرسوورمانی هەموو کەسێک.

کلوور هەموو کات پێی دەگوت کە ئەوەندە زۆر بۆ خۆی نەهێنی، بەڵام ئەو گوێی پێ نەدەدا. بە بڕوای ئەو، دوو دروشمی «من زیاتر تێدەکۆشم» و «هەموو کات ماف بە ناپلیۆنە» وەڵامی هەموو پرسیارێک بوو.

لەگەڵ کەڵەشێرێک کە تازە فێری خوێندن ببوو، بڕیاریان دابوو کە بەیانیان بە جێی نیو کاتژمێر، سێ چارەک زووتر هەڵی بستێنێ.

هەرچەند لەم ڕۆژانەدا کاتی بێکاری کەم بوو، بەڵام هەر کات بۆی بڕەخسایە بە تەنیا دەچوو بۆ لای تەپۆڵکەکە و بە بێ یاریدەری کەس بارێک بەردی دەبرد بۆ لای شوێنی ئاشەکە. هەر چەندە کە کارەکان دژوار بوون، بەڵام باری لەش و ناخی ئاژەڵەکان لە هاویندا زۆر خراپ نەبوو. ئەگەر لە سەردەمی جۆنز توانایيان زیاتر نەبووبێ، کەمتر نەبوو. هەر ئەوەندەی کە پێویست نەبوو خواردن بۆ پێنج مرۆڤی چاوچنۆک پەیدا بکەن و تەنها لە هەوڵی خواردنی خۆیاندا بن، قەرەبووی کەم و کورتیەکانی بۆ کردبوونەوە. لە زۆر یەک لە ئیشەکان شێوەی کاری ئاژەڵەکان پوختەتر و کاریگەرتر لە مرۆڤەکان بوو کە هەر بەم هۆیەوە ڕێژەی کارەکانی کەم دەکردەوە. بۆ وێنە دروونەوەی گیاکان تا ئەو ڕادە بە خاوێنی و باشی بەڕێوە دەچوو کە لە توانایی مرۆڤەکان بە دوور بوو. هەروەها بە هۆی ئەوەوە کە

هیــچ کام لە ئاژەڵەکان دزییان نەدەکرد، ئیتر پێویســت نەبوو کە دیوار و تەیمان و پەرژین بکەن. سەرەڕای ئەمانەش کاتێک کە هاوین کۆتایی هات کەم و کورتی چاوەڕوان نەکراو پەیدا بوون.

نەوت، بزمار، بەن، توێشــە و ئاسن بۆ ناڵی ئەسپەکان پێویست بوون و هیچ کامیشیان لە مەزراکەدا دەســت نەدەکەوت. بەیانی یەکشەممەیەک کاتێــک کە ئاژەڵەکان بۆ وەرگرتنی فەرمان کۆ ببوونەوە، ناپلیۆن ڕایگەیاند کە سیاسەتێکی تازەی ڕەچاو کردووە. لەم ڕێکەوتە بەولاوە، قەڵای ئاژەڵان لە گەڵ مەزراکانی دراوســێ مامەڵە دەکات. هەڵبەت نەک بۆ کەســابەت، بەڵکو تەنیا بۆ بەدەســت هێنانی پێداویســتییەکان. جارێ بڕێک وێنجە و گەنم دەفرۆشــرێ و پاشان ئەگەر پێویستمان بە پارەی زیاتر هەبوو ئەوا بە پێی پێویســت لە بازاڕەکەی ولینگدن، هێلکە دەفرۆشین. هەروەها ناپلیۆن ئەوەشــی گوت کە مریشــکەکان دەبێ لە ئەمڕۆ بە دواوە، بۆ یاریدەدان و هاوکاری کردن لە دروست کردنی ئاشەکە پێشووازی بکەن.

جارێکیتر ئاژەڵەکان بە شــێوەیەکی سەیر هەستیان بە ناخۆشی دەکرد. نەبوونی پێوەندی لە گەڵ مرۆڤ، کاســبی نەکــردن، پارە بەکار نەهێنان، مەگــەر ئەمانە هەموو لە بڕیارە دەرکراوەکانــی ناو یەکەمین کۆ بوونەوەی دوای سەرکەوتنەکە و دەرکردنی جۆنز نەبوون؟

هەموو ئاژەڵــەکان ئەم بڕیارانەیان لە بیر مابوو. ئــەو چوار بەرازە کەم تەمەنەی کە دوای هەڵوەشــاندنەوەی کۆبوونــەوەکان لە لایەن ناپلیۆنەوە، ناڕەزایەتی خۆیان دەربڕیبوو، بە ترســەوە وەدەنگ هاتن کە بە خێرایی بە دەنگی حەوتە و مڕەی ســەگەکان بێدەنگ بوون. پاشــان وەک هەمیشە مەڕەکان «چوار پێ باش دوو پێ خراپ»یان بە باڕەباڕ گوتەوە کە دڵتەنگی ئاژەڵەکان کەم بووەوە.

لە دوای هەموو ئەم قاڕوقوولە، ناپلیۆن چمکی پێشـــەوەی وەک داوای بێدەنگ بوون بەرز کردەوە و ڕایگەیاند کە سەرە و بەرەی هەموو ئیشەکانی هێناوەتە یەک و پێویست ناکا کە ئاژەڵەکان لە گەڵ مرۆڤەکان پێوەندییان هەبێ، بۆ؟ چونکە بە ڕاستی ناجۆر و ناحەزە، هەر بۆیەش بۆ خۆم قورسایی ئەم ئیشە بەئەستۆ دەگرم.

«ویمپـــر» ناوێک کە زانایەکی دادوەرییـــە و لە ولینگدن دەژی، بڕیاری داوە کـــە پێوەندیدەری نێوان قەڵای ئـــاژەڵان لەگەڵ دونیای دەرەوە بێ و بەیانی هەموو دووشەممەیەک بۆ وەرگرتنی فەرمان دێتە قەڵاکەوە.

ناپلیۆن وتەکانی وەک هەموو کات بە دروشـــمی «بژی قەڵای ئاژەڵان» تەواو کرد و ئاژەڵەکانیش دوای خوێندنەوەی سروودی ئاژەڵەکانی ئینگلیز، بڵاوەیان لێکرد.

پاشـــان ســـکوئیلەر بە هەموو مەزراکەدا گەڕا و هەمووی دڵنیا کردنەوە کـــە تا ئێســـتا بڕیارێک دژی کەســـابەت و بە کار هێنانی پـــارە نەدراوە. تەنانەت شێوە پێشـــنیارێکیش نەدراوە. ئەمە هەموو پڕوپاگەندەی سنۆباڵە. بەڵام ســـکوئیلەر زۆر زیرەکانە پرسیاری لێدەکردن کە ئایا ئێوە دڵنیان کە خەونتان نەدیوە!؟ ئایا لە سەر ئەم بابەتە بەڵگەتان بە دەستەوەیە؟ ئایا ئەم شـــتانەی دەیڵێن و بیری لێدەکەنەوە لە شـــوێنێکدا نووسراونەوە؟ هەر لە بـــەر ئەوەش کە بە دڵنیاییەوە لەم بابەتەوە نووســـراوەیەک وەک بەڵگە بە دەستەوە نەبوو، ئاژەڵەکان ڕازی بوون کە بۆ خۆیان هەڵەیان کردووە. هەموو دووشەممەیەک ئاغای «ویمپر» لە سەر بڕیاری خۆی دەهاتە قەڵاکەوە. ئەو پیاوێکی ڕواڵەت شـــەیتان و وردیلە بوو کە لە سەر بابەتی دادوەری ئیشی دەکرد. ســـەرەڕای ئەمانە، پیاوێکی وریا و کاتناس بوو. پێش ئەوەی کەس هەست بکا و بزانێ کە قەڵای ئاژەڵان پێویستی بە پێوەندی لە گەڵ دەرەوە

هەیە، ئەو ئەمەی زانیبوو کە سـوودی باشـی بۆ ئەو تێدایە. ئاژەڵەکان بە ترس و دڵەڕاوکێوە لە هاتووچۆکەی ئەویان دەڕوانی. تا بۆشیان بکرایە لێی دوور دەکەوتنـەوە. بەڵام بینینی ئەوەی کە ناپلیۆنی چوار پێ، فەرمانی بۆ ویمپـری دوو پێ دەردەکرد، ببووە هـۆی لەخۆ بایی بوونی ئاژەڵەکان و تا ڕادەیەک قەرەبووی ترس و دڵەڕاوکێکانی دەکردەوە.

پێوەنـدی مـرۆڤ و ئاژەڵ وەک پێشـووو نەبوو. مرۆڤەکان ئێسـتاش باوەڕیـان وابوو کە درەنگ یان زوو قەڵاکە دەکەوێتەوە دەسـتی جۆنز. لە مەڕ ئاشـەکەش، ڕایان وابوو کە سـەر ناگرێ. مرۆڤـەکان کۆ دەبوونەوە و بە بەڵگەوە بە یەکتریان دەسـەلماند کە ئاشـی با تێک‌دەچێ و ئەگەریش وانەبێ، ئەوە بێ‌سوود دەمێنێتەوە.

بەڵام سەرەڕای هەموو ئەمانە بە ڕێزەوە سەیری ئیدارە کردنی مەزراکە و کار و ئیشـی ئاژەڵەکانیان دەکرد. یەکێک لـەو کاردانەوانە ئەمە بوو کە وردەوردە مەزراکەیـان بە ناوی قەڵای ئاژەڵان ناو دەبرد و ئیتر بە مەزرای مانێریان نەدەناسـی. لە گەڵ ئەمانەش چیتر هیوایان بە جۆنز نەمابوو کە بتوانێ ڕۆژێک لە ڕۆژان بگەڕێتەوە بۆ مەزراکە و هەر بۆیەش پشـتیوانییان لەو نەدەکرد.

جگە لە ویمپر لە بەینی قەڵاکە و دونیای دەرەوە پێوەندیەکی‌تر نەبوو، بەڵام ئەم بەند و باوە هەبوو کە ناپلیۆن بە تەمایە، گرێبەستێکی نەگۆڕ یان لە گەڵ ئاغای بیل کینگتن خاوەنی فاکس وود یان ئاغای فریدریک خاوەنی پێنج فیلد ببەسـتێ، بەڵام هیچ کات وتەی مامەڵە لەگەڵ هەردووکیان لە یەک کاتدا لە ئارادا نەبوو.

هەر لـەم کاتانەدا بوو کە لـە کتوپڕدا بەرازەکان بـۆ خانووبەرەی ناو مەزراکە ڕاگوێزران و ئەوێیان کرد بە شـوێنی نیشـتەجێ بوونیان. دیسان

وا هاتە بیری ئاژەڵەکان کە لە سـەرەتای ڕۆژانی سەرهەڵدانەکە، بڕیارێک جگە لەمە دراوە کە دیسـان سکوئیلەر توانی ئەوان ڕازی بکا کە بەو جۆرە نەبووە و ئەوان هەڵەن.

گوتی بەرازەکان مێشکی بیرمەندی مەزراکەن. پێویستییان بە شوێنێکی مەند و بێدەنگە. لە گەڵ ئەوانەشدا بۆ شکۆی پێشەوا واباشە (لەم دواییانەدا ناپلیۆنی بە پێشـەوا ناو دەبرد) کە لە ماڵدا بێ، نەک لە شوێنی بەرازەکان. سەرەڕای هەموو ئەم باسـانە، بڕێک لە ئاژەڵەکان لەوەی کە بەرازەکان لە چێشـتخانەدا نان دەخۆن، هۆڵی میواندارییان کردۆتە شوێنی حەوانەوەیان و لە سەر قەرەوێڵە دەخەون، بە پەرۆش بوون.

باکسـر وەک هەمیشـە بە دروشـمی «هەموو کات ماف بە ناپلیۆنە» سەرپۆشـی لە سـەر هەڵەکانی ناپلیۆن دادەنا. بەڵام کلـوور کە وای بیر دەکـردەوە کە قەرەوێڵە بە ئاشـکرا قەدەغە کراوە، چـوو بۆ عەممارەکە و هەوڵیدا مەتەڵەی حەوت فەرمانی نوسراوەی سەر دیوارەکە، ڕوون بکاتەوە. بەڵام چون بەس دەیتوانی پیتە جیاکان بخوێنێتەوە، چوو بۆ لای موریل و گوتـی موریل مادەی چوارەمم بۆ وەخوێنە و بزانە لەم فەرمانەدا نەگوتراوە کە لە سەر تەخت نوستن، ناڕەوایە؟!

موریـل بە تۆزێک هەڵەوە خوێندییـەوە و لە ئاکامدا گوتی ئەم بڕگەیە دەڵێ، هیچ ئاژەڵێک بۆی نییە بە پێخەف لە سەر تەخت بخەوێ.

کلوور لای سەیر بوو کە نەیدەتوانی وەبیر خۆی بێنێتەوە کە پێشتر لە فەرمانەکەدا باسـی پێخەف کرابێت. بەس ئێستا کە دەبینێ نوسراوە بۆی هەیە بەرازەکان بە مەرجێک پێخەفیان پێوە نەبێ بتوانن لە سـەر تەخت بخەون. ئەم ڕاستییەش پاش هاتنی سکوئیلەر و سێ سەگ لە قەڕاوڵەکان بە تەواوی ڕوون بووەوە!

سـکوئیلەر گوتی هاوڕێیان بۆی هەیە بیستبێتان کە ئێمەی بەراز لە ئێستادا لە سـەر تەخت دەخەوین. ئەوەش دەزانن کە ئێمە بۆ ڕێز گرتن لە بڕگەی چواری فەرمانەکە هەموو ئەو دۆشەکە نەرمانەی کە مرۆڤەکان لە سەری وەردەکەوتن، تووڕمان هەڵداون و بەس بە پێخەفێکی تەنک دەخەوین. خۆ ئێوەی هاوڕێ ئەمەتان ناوێ کە پاش ئەو هەموو بیر کردنەوە و هەڵگوشینی مێشکمان ئێمە شەوانە لە سەر گڵی ڕەق و تەق بمێنینەوە. باشیش دەزانن کە جیاوازی زۆری لە گەڵ کاوکۆڵی ناو تەویلەکەدا نییە! خۆ خوازیاری گەڕانەوەی جۆنزیش نین؟!

ئاژەڵەکان کە تا ئەم کاتە بێدەنگ مابوون بە کۆی دەنگەوە بۆ گەڕانەوەی جۆنز وەڵامی نەخێریان دایەوە و لەو کاتە بە دواوە باسی شێوەی خەوتنی بەرازەکانیان نەکردەوە. تەنانەت ئەو کاتەش کە گوتیان لە ئێستا بە دواوە بەرازەکان ڕۆژانە کاتژمێرێک درەنگتر لە خەو هەڵدەستن، کەس دژایەتی نەکرد.

لە پاییزدا ئاژەڵەکان سـەرەڕای ماندوویی زۆر، دڵیان گەلێک خۆش بوو. ساڵێکی دژواریان بردبووە سەر. پاش فرۆشتنی بڕێک وێنجە و دەغڵ و دان، ئێستاش پاشەکەوتیان ئەوەندە زۆر نەبوو کە بەشی زستانیان بکا. بەڵام ئاشەکە دەیتوانی قەرەبووی زۆر یەک لەو کەم و کورتیانە بکاتەوە! دوای هەڵگرتنی خەرمانەکە چەند ڕۆژێک کەش و هەوا بۆ ئیش کردن زۆر سازگار نەبوو. بەڵام ئاژەڵەکان باشیان دەزانی کە بەرز کردنەوەی یەک بست لە دیواری ئاشەکە هەڵگری کێشانی هەموو ڕەنجێکە. باکسر تەنانەت شەوانەش لە بەر مانگەشەودا چەند کاتژمێرێک کاری دەکرد. ئاژەڵەکان لە کاتی بێکاریدا، لە دەوری ئاشەکە کۆ دەبوونەوە و لە سەر قایمی و پتەوی دیوارەکان دەدوان و بە بینینی ئەو بینایە شاگەشکە دەبوون. لەو ناوەدا

تەنیا بنجامین هیچ ڕا و بۆچوونێکی نەبوو، بەس وەک پێشوو بە شێوەیەکی سەیر دەیگوت گوێ درێژەکان تەمەنیان درێژە!

به هاتنی مانگی نۆڤەمبەر با و باران دەســتی پێکرد و بە هۆی ئەوەی کە نەدەتوانرا چیمەنتۆ بەرهەم بهێنن، کاری سازکردنی ئاشەکە ڕاگیرا.

شــەوێک بایەکی توند هەڵیکرد کە لە ئاکامدا خانووبەرەی ناو مەزراکە لە بناخەوە ســەر جووڵە هاتن و لە سەر بانی عەممارەکە سواڵەتێک کەوتە خوارەوە. مریشــکەکان ترسان و لە خەو ڕاچڵەکان، هەر ئەو کاتە بە تێکرا، دەنگی تەقەی تفەنگێکیان هاتبووە گوێ. کاتی بەیانی کە ئاژەڵ هاتنە دەر، بینیان کە ئاڵاکە کەوتووە و دارێکی ئەســتووری ناروەن، وەک گێزەرێک، لــە ڕەگەوە هەڵکەندرابوو. کاتێک چاویان بە ئاشــەکە کــەوت بەو پەڕی نائۆمێدیەوە لە ناخەوە هاواریان لێ بەرز بووەوە.

ئاشــەکە وێران ببوو. هەموو چوون بۆ شــوێنی ڕووداوەکە. ناپلیۆن کە هەمووکات هەنگاوی هێواشی دەنا، لە پێش هەموویانەوە ڕایدەکرد.

بەرهەمــی هەموو ماندوویی ئەو ســاڵەیان ڕێکی عەرزەکــە ببوو. ئەو بەردانەی کە بە زەحمەت شکابوون و هێنرابوون، لە دەور و بەری ئاشەکە بڵاو ببوونەوە.

هەموو زمانیان بەســترابوو. بە شێوەیەکی حەپەســاو دەیانڕوانییە ئەو بەردانــەی کە وەک هێمایەکی دزێو، دەمی لــێ خوار دەکرِدنەوە. ناپلیۆن بــە بێدەنگی هەنگاوی دەنا و جار و باریش بۆنــی بە عەرزەکەوە دەکرد. کلکی بە نیشانەی کار کێشانەوەی زۆر لە مێشکی قوت ببوو. بە خێراییش دەیجووڵانــد. لە کتوپڕدا وەک ئەوەی کە بە ئاکام گەیشــتبێ ڕاوەســتا و گوتــی: «هاوڕێیان دەزانن هۆکاری ئەم ڕووداوە کێیــە؟» ئێوە ئەو دوژمنە دەناسن کە شەو هاتووە و ئاشەکەمانی ڕووخاندووە؟ «سنۆباڵ». دیسانەوە بە

دەنگێکی نێر دووپاتی کردەوە، «سنۆباڵ ئەمەی کرد». ئەو خائینە، بەس لە بیری ئەوەدایە کە نەخشەکانمان پووچەڵ بکاتەوە و تۆڵەی دەرکردنەکەمان لێبکاتەوە. لە پەنای تاریکی شەودا هاتووە و ڕەنجی یەک ساڵەی ئێمەی بە فیڕۆ داوە. هاوڕێیان هەر ئێستا و هەر لەم شوێنەدا فەرمانی لە سێدارەدانی سـنۆباڵ دەردەکەم و ڕایدەگەیەنم کە نیشـانی پلەی دووی ئاژەڵی و نیو کیلۆ سێو خەڵاتی ئەو کەسەیە بیکوژێ و یەک کیلۆ سێویش خەڵاتی ئەو کەسەیە بە زیندوویی بیگرێ.

ئاژەڵـەکان لەوەی کـە ئاژەڵێک، تەنانەت سـنۆباڵ، بتوانێ تا ئەو ڕادە تاوانبار بێ، سـەریان سـووڕمابوو! هاواری تۆرەییان بەرز کردەوە. لە بیری ئەوەدا بوون کە ئەگەر گەڕایەوە بە چ شـێوەیەک بیگرن. تا ڕادەیەکی زۆر شوێن پێی بەرازێک لە ناو شینکاڵەکەدا دۆزرایەوە. شوێنەکە چەند مەترێک دیـار بوو. وەک ئەوە کە بە دەلاقەی پەرژینەکە دەبڕایەوە. ناپلیۆن بۆنی بە شـوێنە سـمەکەوە کرد و گوتی جێ پێی سنۆباڵە و بۆی هەیە کە لە لای مـەزرای فاکس وودەوە هاتبێت. ناپلیۆن دوای تاقیکردنەوەی شـوێنپێکە هاواری کرد: «هاوڕێیان، چیتر بۆ درەنگ نابێ. ئەبێ تێبکۆشـین. ئێمە هەر لە ئەمڕۆوە دەسـت بە دروست کردنەوەی ئاشەکە دەکەینەوە و لە هەموو زستاندا، چ بباری و چ نەباری، سازی دەکەینەوە تا بەو خائینی بێ ویژدانە بسـەلمێنین کە بە ئاسـانی ناتوانێ کارەکەمان هەڵوەشێنێتەوە. هاوڕێیان دەبـێ لە یادتان بێ کە نابێ لە نەخشـەکەماندا گۆڕانکاری هەبێ و دەبێ ئیشەکەمان لە سەر وادەی خۆیدا تەواو ببێ. هاوڕێیان بۆ پێشەوە! هەر بژی ئاشی بایی! پایەدار بێ قەڵای ئاژەڵان!»

□

## وەرزی ٧

زســـتانێکی دژوار بوو. تاڵ و تووشـــی و بەفر و باران، ئـــەو کات بەدوایاندا زوقم و ســـەهۆڵبەندان کە تا مانگی فێوریە درێـــژەی هەبوو. ئاژەڵەکان تا ئەو ڕادەی تواناییان هەبوو بۆ دروســـت کردنەوەی ئاشـــەکە تێکۆشـــانیان کرد. ئەوان ئاگاداری بەر چاو بوونی ئاشـــەکە لـــە جیهانی دەرەوە بوون و دەیانزانی ســـەرنەکەوتن یان دواکەوتن لە دروست کردنی ئاشەکە دەبێتە هۆی کامەرانی و خۆشی مرۆڤی چاو چنۆک.

مرۆڤەکان لـــە ڕووی ڕق و ناپاکییەوە دەیانگوت کە هۆی وێران بوونی ئاشەکە سنۆباڵ نەبووە. دەیانگوت هۆکارەکەی باریکی و سستی دیوارەکان بـــووە. ئاژەڵەکان هـــەر چەندە کە باوەڕیان بـــەم پڕوپاگەندانە نەبوو، بەڵام دڵنیاش بوون کە دەبێ دیوارەکان لە جێی هەژدە ئینچی پێشوو بە پانایی ســـێ فووت دروست بکرێنەوە. هەر بەو هۆیەوە پێویستیان بە بەردی زیاتر هەبوو. بۆ ماوەیەکی زۆر بەردەکان لە ژێر بەفردا بوون و کارەکە پێشکەوتنی بە خۆیەوە نەدەدی. لە هەوای ســـارد و ئاسمانی بێ هەور و هەساوی پاش

بەفر بارین تا ڕادەیەک هەوڵەکان بەرچاوبوون. سەرباری قورسیی کارەکە بێ هیوایی ئاژەڵەکانیش ببووە کۆسپێک لە بەردەم دروست کردنەوەی ئاشەکە. هەموو کات سەرمایان بوو. زۆربەی ساتەکانیش برسی. بەس باکسر و کلوور خۆیان نەدابووە دەست دڵساردی و ناهومێدی. سکوئیلەریش لە سەر خۆشیی خزمەت و پلە و پایەی بەرزی ئیش کردنەوە دەدوا، بەڵام ئاژەڵەکان زیاتر بە هێزی باکسر و هاواری نەکوژاوەی کە دەیگوت؛ «زیاتر تێدەکۆشم»، دڵگەرم دەبوون.

لە ژانەویەدا خۆراک کەمی هێنا. جیرەی دەغڵ و دان بەڕادەیەکی بەرچاو کەم بووەوە و ڕاگەیەنرا کە بە هەر کەس سەلکێک پەتاتە بۆ قەرەبوو کردنەوەی کەم بوونی دەغڵ و دانەکە دەدرێ. بەڵام کاتێ کە دەرکەوت زۆربەی زۆری پەتاتەکان بە هۆی ئەوەوە کە گڵیان کەم لە سەر بووە، خراپ بوونە و سەرما بردە و ڕزیون. کەمێکیان نەبێ ، ئەوانیتر نەرم و بێڕەنگ ببوون. زۆرجار چەند ڕۆژ ئاژەڵەکان بێجگە لە کای کۆن و چەوەندەر شتێکیان نەدەخوارد. لە گەڵ قاتی و قڕیدا مەودایەکی زۆریان نەبوو. کاری سەرەکی شاردنەوەی بار و دۆخەکە لە جیهانی دەرەوە بوو. ڕووخانی ئاشەکە مرۆڤەکانی گوستاخ کردبوو و درۆی تازەش لە مەڕ قەلاکە، پەرەیان ستاندبوو. جارێکیتر بڵاو بووەوە کە ئاژەڵەکان بە هۆی قاتی و ناخۆشی ژیانەوە ململانێی مردن دەکەن و زۆربەی کاتیش لە گەڵ یەک بە شەڕ دێن و ملیان داوەتە خواردنی یەکتر و بەچکەی خۆیان. ناپلیۆن کە بە باشی لە ئاکامی دزە کردنی بار و دۆخەکە بۆ دەرەوەی مەزراکە ئاگادار بوو، لە بوونی ئاغای ویمپر کەڵکی وەرگرت و زۆر هەواڵ و باسی وا کە پڕوپاگەندەکانی بێ پووچەڵ بکاتەوە، بڵاو کرانەوە. ئاژەڵەکان تا ئەم کاتە لە گەڵ ئاغای ویمپردا کە حەفتەی جارێک دەهات بۆ قەلاکە، چاو پێکەوتنیان

نەبوو، بەڵام ئێستا چەند دانەیان کە زۆربەشیان مەڕ بوون، هەڵبژێردرابوون بۆ ئەوەی بە شـــێوەیەکی چاوەڕوان نەکراو بە گوێی ئاغای ویمپر بگەیەنن کە ڕادەی جیرەی ڕۆژانە زیادی کردووە. ناپلیۆنیش فەرمانی دەرکردبوو کە پووتە خاڵیەکان پڕکەن لە گڵ و سەرانســـەرەکانیان بە خواردن داپۆشن و لە عەممارەکە بە شـــێوەیەک دایان نێن کە لە بەرچاوی ئاغای ویمپر بن. ناپلیۆنیش بە شـــێوەیەکی کەم بایەخانە پووتەکانی پێ نیشـــان بدا. ویمپر کڵاوی ســـەر چوو و ئەوجار لە دەرەوەی قەڵاکە باســـی لە زۆری خواردنی ئاژەڵەکان دەکرد و دەیگوت کە لە قەڵای ئاژەڵەکان پاشەکەوتی خواردنەکە کەمی نەهێناوە.

لــە ئاخـــری ژانویەدا، بۆ هەمـــوو کەس ڕوون و ئاشـــکرا بوو کە دەبێ بڕێـــک دەغڵ و دان پەیدا بکەن. ئەم ڕۆژانە ناپلیۆن بە کەمی دەردەکەوت و زۆربـــەی کاتەکەی لـــە خانووبەرەی نـــاو مەزراکەدا بەســـەر دەبرد کە ســـەگە زلەکان دەرگەوانییان دەکرد. هـــەر کاتیش بهاتبایەتە دەرەوە ئەوە بە ڕێوڕەســـمێکی تایبەت و شەش سەگ پاســـەوانی بوون. سەگەکان لە نزیکەوە دەڕۆیشتن و بە مڕەمڕ و لرخەلرخ نەیاندەهێشت کەس لە ناپلیۆن نزیک وەبێ. بەیانیانی یەکشەممەش ئیتر نەدەهات و فەرمانەکانی خۆی بە هۆی یەکێ لە بەرازەکان کە زیاتر سکوئیلەر بوو، بە ئاژەڵەکان ڕادەگەیاند.

یەکشـــەممەیەک سکوئیلەر ڕایگەیاند کە مریشکەکان کە دیسان کاتی هێلکـــە کردنیانە، دەبـــێ هێلکەکانیان بدەن بەدەســـتەوە. ناپلیۆن لە ڕێی ویمپرەوە گرێبەســـتێکی بۆ فرۆشـــتنی چوارســـەد هێلکە لە حەفتەیەکدا بەســـتووە. بـــە نرخی هێلکەکان، دەغڵ و دان و خـــواردن تا هاوین دابین دەکات. کاتێ مریشکەکان ئەمەیان بیست دەنگی نارەزایەتیان بەرز بووەوە. پێشـــتر ئەگەری ئەو لەخۆبردوویە هەبو،و بـــەڵام باوەڕ نەدەکرا کە ڕۆژێک

ئەمە بە هێزی زۆر ئەنجام بدەن. مریشـــکەکان خۆیان ئامادە کردبوو تا لە بەهاردا کڕکەون و هەر بۆیەش ســتاندنی هێلکەکانیان لەوەها کاتێکدا بە جینایەت دەزانی. لە کاتی دەرکردنی جۆنز بۆ یەکەم جار شێوە ڕاپەڕینێک ســەری هەڵدا. مریشـــکەکان لە ژێر ڕێبەڕایەتی ســێ مریشکی سپانیایی دەیانویســـت کە خواســـتی ناپلیۆن پووچەڵ بکەنەوە. هەر بەم مەبەســـتە دەچوونە شـــوێنە لێژەکان هێلکەیان دەکرد و لە ئاکامدا دەشکان. ناپلیۆن بـــە پەلە و بێ بەزەییانە دەســـت بـــەکار بوو. فەرمانی بـــە بڕینی جیرەی مریشـــکەکان دا و ئەمـــری دەرکرد هەر ئاژەڵێـــک هاریکاریان بکات ئەوە سزاکەی مردنە. سەگەکان وریا بوون کە فەرمانەکان بێ کەم و زۆر بەڕێوە بچـــن. مریشـــکەکان پێنج ڕۆژ خۆیان ڕاگرت، بەڵام لـــە ئاکامدا خۆیان دا بە دەســـتەوە و بۆ هێلکە کردن گەڕانەوە نـــاو کولانەکانیان. لەم ماوەدا نۆ مریشک گیانیان لە دەست دا. تەرمەکانیان لە باخە میوەکەدا ژێر گڵ خران و بڵاوکرایەوە کە مریشکەکان بە هۆی نەخۆشی خروزەکەوە مردوون. ویمپر شـــتێکی لەم بارەوە نەزانی و هێلکەکان لە کاتی دیاریکراودا کۆ کرانەوە و ماشێنێکی باری، حەفتەی جارێک بۆ بردنی هێلکەکان دەهاتە مەزراکە.

لـــەم ماوەیەدا لە ســـنۆباڵ هەواڵێک نەبوو. وا بڵاو بـــووەوە کە ئەو لە یەکێک لەو دوو مەزرایەی دراوســـێ واتە فاکس وود یان پێنچ فیلد خۆی شـــاردۆتەوە. پێوەندی ناپلیۆن لە گەڵ جووتیارەکانی دراوسێ بەرەو باشی دەچـــوو. بـــڕێ دار و มوورەدار کە لە دە ســـاڵی ڕابـــردوودا بڕدرابوون، لە حەوشـــەکەدا عەممار کرابوون و ئێســـتا بە تەواوی وشک و بە کەڵکهاتوو بـــوون. ویمپر بە ناپلیۆنی گوتبوو کە بیانفرۆشـــێ. ئاغـــای بیل کینگتن و ئاغـــای فریدریک هـــەر دوو خوازیاری کڕینیانن. ناپلیـــۆن دوو دڵ بوو کە کامیـــان هەڵبژێرێ. هەر کات کە دەیهەویســـت لە گەڵ فریدریک مامەڵە

بکات، دەگوترا ســـنۆباڵ لە فاکس وود خۆی شاردۆتەوە و هەر کاتیش کە خوازیـــاری مامەڵە لە گەڵ بیل کینگتن بوو بڵاو دەبووەوە کە ســـنۆباڵ لە پێنج فیڵدە.

لـــە کتوپڕدا لە وەرزی بەهار، باســـێکی ترســـێنەر کەوتە ســـەر دەمی ئاژەڵەکان. سنۆباڵ شەوانە بە دزییەوە هاتووچۆی مەزراکە دەکا! ئەم هەواڵە بە جۆرێک ئاژەڵەکانی ترســـاند کە شـــەوانە خەویان لێنەدەکەوت. وا بڵاو ببووەوە کە ئەو شـــەوانە لە پەنای تاریکیدا، دێ بۆ مەزراکە و هەموو جۆرە کارێکی خراپە دەکا. دەغڵ و دان دەدزێ. ســـەتڵە شیرەکان قڵم دەکاتەوە. تۆوەکان پێشـــێل دەکا و گۆپکەی دارەکان دەجوێ. ئەوە بوو هەر کاتێک خراپەیەک دەکرا، دەگوترا هۆکارەکەی ســـنۆباڵە. شیشە پەنجەرە بشکایە و ئاو بەربەســـت بکرایە، دەگوترا سنۆباڵ شەو هاتووە و ئەم ئیشەی کردووە. کاتێک کلیلی عەمماری خۆراکەکە بزر ببوو، هەمووی ئاژەڵەکان دڵنیا بوون کە سنۆباڵ لە بیرەکەی هاویشتووە. سەیر ئەوە بوو کاتێک کلیلەکە لە ژێر تەلیســـێکدا دۆزرایەوە دیسان لە سەر قسەی خۆیان سوور بوون. مانگاکان یەک دەنگ دەیانگوت کە ســـنۆباڵ بە دزییەوە شـــەوانە دەچێتە شـــوێنی مۆڵینیان و کاتێک کە لە خەودان دەیان دۆشێ. ئەوەش دەگوترا کە مشکە دەشـــتەکییەکان کە لە زستاندا ببوونە هۆی ئازار و ئەرک، لەگەڵ سنۆباڵ دەست تێکەڵن.

ناپلیـــۆن بڕیاریـــدا کـــە لە ســـەر هەڵـــس و کەوتەکانی ســـنۆباڵەوە چاوەدێرییەکـــی زیاتر بکرێ. لە کاتێکدا کە ســـەگەکان بە دەور و بەریەوە بوون و ئاژەڵەکانیش بە نیشـــانەی ڕێـــز گرتن چەند هەنگاوێک لە دوایەوە دەڕۆیشـــتن، چووە دەرەوە و لە هەموو شوێنەکانی مەزراکە بە وردی گەڕا. هەر چەند هەنگاو جارێک ڕاوەســـتەی دەکرد و بۆ دۆزینەوەی شوێنەواری

ســـنۆباڵ بۆنی بە عەرزەکەوە دەکرد. هەر چوار سووچی تەویلەی گاڕانەکە، کولانکەی مریشـــکەکان و باخچەکەی بۆن کرد و لە زۆربەی شـــوێنەکان، شـــوێنەواری سنۆباڵی بەدی کرد. لووتە پانەکەی بە سەر گڵ و سەوزەکاندا دەکێشا و چەند هەناســـەی قووڵی هەڵدەمژی و بە دەنگێکی ترسێنەرەوە دەیگوت: «ســـنۆباڵ لێرە بووە! من بۆنەکەی دەناسمەوە!» بە بیستنی ناوی سنۆباڵ، ســـەگەکان کەڵبەکانیان گڕ دەکرد و بە شێوەیەک دەیانمڕاند کە خوێن لە لەشدا دەمەیی.

ئاژەڵـــەکان بە تـــەواوی خۆیان دۆڕاندبوو. ســـنۆباڵ وەک بوونەوەرێکی نەبینـــدراو دەهاتە بەر چاو کە هەموو شـــوێنێکی داگیـــر کردووە و ئەوان ڕوبەڕووی هەرجۆرە مەترسییەک دەکاتەوە. کاتی شەو سکوئیلەر ئاژەڵەکانی کۆ کردەوە. لە کاتێکدا کە تووڕەیی لە ڕوخســـاری دەباری، گوتی باسێکی گرنگ هەیە کە دەبێ بۆتانی بڵێم.

لـــە کاتێکدا کە بە هۆی قەڵســـیی خۆیەوە جم و جووڵێکی نائاســـایی هەبوو، هاواری کرد: «هاوڕێیان، شتێکی زۆر گرنگ و ترسێنەرمان بۆ ڕوون بووەتەوە. ســـنۆباڵ خۆی فرۆشـــتوە بە فریدریک خاوەنی پێنج فیڵد کە بە تەمایە هێرشـــمان بکاتە سەر و مەزراکەمان داگیر بکا! وا بڕیار دراوە کە کاتی هێرشـــەکە، سنۆباڵ ڕێ نیشـــاندەری بێ. باسەکە لەوەی کە بیرمان لێدەکردەوە گرنگترە. ئێمە واماندەزانی کە هۆی سەرپێچییەکەی سنۆباڵ، خۆشەویســـتی پلە و پایە و خۆ بە زل زانینە! بـــەڵام هاوڕێیان ئێمە هەڵە بووین! ئێوە هۆی سەرەکی سەرپێچییەکەی دەزانن؟! ئەو هەر لە سەرەتاوە لـــە گەڵ جۆنزدا هاوپەیمان بوو. لە هەموو کاتەکاندا ســـیخوڕی بۆ دەکرد. هەموو ئەم شـــتانە لە ڕووی بەڵگە و نووســـراوە بە جێماوەکانی ئەوەوە دەر کەوتوون. بە ڕای من ئەم بەڵگانە شتی زۆرمان بۆ ڕوون دەکەنەوە هاوڕێیان!

مەگەر بۆ خۆمان نەماندی کە لە شەڕی گادانەکەدا تا چ ڕادەیەک تێکۆشا؟ بەڵام بە خۆشییەوە سوودی بۆی نەبوو و ئێمە سەرکەوتین». ئاژەڵەکان گێژ و سەرســـام ببوون. ئەمە ئیتر لە کێشەی ڕووخانی ئاشەکە زۆر گرنگتر بوو. چەند چرکەیەکی پێچوو تا مەبەســـتی وتەکانی سکوئیلەریان بۆ دەرکەوت. لە بیریان بوو یان وایان بیر دەکردەوە کە سنۆباڵ لە شەڕی گادانەکەدا لە پێش هەموو ئاژەڵەکانەوە هێرشی برد و ئاژەڵە بڵاوە بووەکانی کۆ کردەوە و هانی دەدان بۆ هێرش بردن و شەڕ کردن. بۆ ساتێک، تەنانەت کاتێک کە ســـاچمەکانی تفەنگەکەی جۆنز شانیان بریندارکرد، نەوەستا. نەدەتوانرا کە باوەڕ بکەن ئەم هەموو ئازایەتیانەی بۆ پشتیوانی لە جۆنز بووبێت. تەنانەت باکســـریش کە هیچ کات پرسیاری نەدەکرد سەرسام بوو. هەر بۆیە مۆڵیو و دەســـتەکانی لە ژێر خۆیدا کۆ کردەوە و چاوەکانی نووقاند و هەوڵیدا بیر و بۆچوونەکانـــی ڕێک بخاتەوە. گوتی: «من بـــاوەڕ ناکەم. من بۆ خۆم دیم کە ســـنۆباڵ لە شەڕەکەدا بە لەخۆبردوویی و ئازایەتییەوە شەڕی کرد. ئەی هەر بۆ خۆمان دەســـت بە جێ پاش شەڕەکە میداڵی ئازایەتی پلە یەکمان پێ نەبەخشی؟»

ســـکوئیلەر لە وەڵامدا گوتی: «هاوڕێ بە هەڵەدا چووین. ئێستا لە ڕووی بەڵگە نهێنییەکانەوە بۆمان ڕوون بووەتەوە کە ئەو دەیهەویســـت بە لاڕێدا بمانبا». باکســـر گوتـــی: «بەڵام ئەو بریندار بـــوو. هەموومان دیتمان کە لە برینەکەیەوە خوێن دەهات».

ســـکوئیلەر نەڕاندی: «ئەمەش بەشێک لە نەخشەکەی بوو! جۆنز بەس بە شێوەیەکی هاکەزایی ڕووشـــاندبووی! ئەگەر ئێوە توانای خوێندنەوەتان هەبوایە ئەمن ئەم شتانەم لە ڕووی نووسراوەکەی خۆیەوە پێ نیشان دەدان. نەخشەکەشیان ئەوە بوو کە سنۆباڵ لە کاتێکی ناسکدا فەرمانی پاشەکشە

دەر بـــکات و مەزراکە بخاتە دەســـت دوژمن، تا ڕادەیەکیش ســـەرکەوتوو بـــوو. هاوڕێیان ئەگەر ئازایەتی و لەکارزانی ڕێبـــەری ئێمە هاوڕێ ناپلیۆن نەبوایـــە ئەو لە پیلانەکەی خۆیدا بە تەواوی ســـەردەکەوت. بۆ بیرتان نییە کاتێک کە جۆنز و پیاوەکانی لە حەوشەکەدا بوون بە چ شێوەیەک سنۆباڵ پشتی تێکردین و هەڵات و بەشێک لە ئاژەڵەکانیشی دوای خۆی خست؟! هەروەها ئایاکوو لە بیرتان نییە ڕێک ئەو کاتەی کە ترس بە سەرماندا زاڵ ببوو و وا دەهاتە بەرچاو کە هەموو شـــتێکمان لە دەستدا، هاوڕێ ناپلیۆن بە دروشـــمی، نەمان بۆ مرۆڤایەتی، چووە پێشـــەوە و بە ددانەکانی قاچی جۆنزی گرت و بریندار ی کرد؟»

ســـکوئیلەر ئەمبەرا و بـــەری زۆر دەکرد و بە دەنگێکـــی بەرزە گوتی: «هاوڕێیان خۆ ئەمەتان لە بیرە؟»

کاتێک کە ســـکوئیلەر ئەم شـــیکاری و ڕوونکردنەوانـــەی تەواو کرد وا هاتە بیر و مێشکی ئاژەڵەکانەوە کە هەموویان لە یادە. ڕاکردنی سنۆباڵ لە کاتی ناسکی شـــەڕەکە هاتەوە بیریان. بەڵام باکسر ئێستاش دڵنیا نەبوو و لە ئاکامدا گوتی: «من باوەڕ ناکەم ســـنۆباڵ هەر لە پێشـــدا خائین بووبێت. ئـــەوەی لە دواییدا کردوویەتی شـــتێکی ترە. بەڵام مـــن دڵنیام کە ئەو لە شەڕی گادانەکەدا هاوڕێیەکی باش بوو».

ســـکوئیلەر لە کاتێکدا کـــە دانەدانە و بە دەنگی بەرز قســـەی دەکرد، گوتی: «هاوڕێ، ڕێبـــەری ئێمە، هاوڕێ ناپلیۆن، بـــە دڵنیاییەوە، بەڵێ، بە دڵنیاییەوە، گوتوویەتی کە ســـنۆباڵ هەر لە سەرەتاوە، بەڵێ تەنانەت پێش ئەوەی بیرۆکەی ڕاپەڕین هەبێ، پیاوی جۆنز بووە». باکسر گوتی: «ئێستا کە هاوڕێ ناپلیۆن بیروبۆچوونی بەم جۆرەیە بەس دەبێ بڵێین وایە!» سکوئیلەر بە ســـەر باکسردا نەڕاندی و گوتی: «ئێستا بە چاوێکی کراوەوە لە بابەتەکە

دەڕوانی؟» لە کاتی گەڕانەوەدا هەڵوێستەیەکی کرد و شێوە هەڕەشە و کاریگەر ئەمەشی گوت: «بە هەموو ئاژەڵەکانی ئەم مەزرایە دەڵێم کە چاوتان باش وەکەن. لە بەر ئەوەی زۆر ئاسەوار هەن کە پێمان دەسەلمێنن کە لەم کاتەدا و لە ناو ئێمەدا، پۆلێک بەکرێگیراوی سنۆباڵی تێدایە کە بە شێوەیەکی نهێنی خەریکی سیخوڕی کردنن».

پاش چوار ڕۆژان دەمەو ئێوارە ناپلیۆن فەرمانی دەرکرد کە ئاژەڵەکان لە حەوشەکەدا کۆ وەبن.

کاتێک کە هەموویان هاتن، ناپلیۆن کە هەر دوو نیشانەکەی (لەم دواییانەدا نیشانی پلەیەکی ئازایەتی و پلە دووی ئاژەڵی دابوو بە خۆی) لە سەر سینگی خۆی هەڵواسیبون، بە نۆ سەگی زلەوە کە لە دەور و بەری هاتووچۆیان دەکرد و بە مرەمرِی خۆیان ترسێکی زۆریان خستبووە دڵی ئاژەڵەکانەوە دەرکەوت.

هەموو ئاژەڵەکان بێدەنگ لە سەر جێی خۆیان وەستان و لە ترسان سەریان لە پۆر نابوو. وا دیار بوو کە پێشتر دەیانزانی کە ڕووداوێکی ترسێنەر لە پێشە.

ناپلیۆن وەستا و ترش و تاڵ لە بەشداربووانی ڕوانی. پاشان نووزەیەکی درێژی لێهات و بەو دەنگە سەگەکان هاتنە پێشەوە و گوێی چوار بەرازیان گرت و ئەوانیان خستە بەر دەمی ناپلیۆن. لە گوێی بەرازەکان خوێن دەتکا و سەگەکانیش بە بۆنی خوێنەکە تەواو هار ببوون. لە ناو سەر سووڕمانی جەماوەرەکە سێ دانە لە سەگەکان بەرەو باکسر هەڵمەتیان برد. باکسر کە هێرشی سەگەکانی دی، سمە گەورەکانی خستە کار و لەقەیەکی لە یەکێک لە سەگەکان دا و خستییە سەر عەرزەکە. سەگەکە دەستی کرد بە لنگە فرتە و قرووسکە قرووسک. ئەو دوو سەگەی تر کلکیان لە نێو گەڵی

خۆیان توند کرد و هەڵاتن. باکسـر چاوی لە ناپلیۆن بڕی تا بزانێ واز لە سەگەکە بهێنێ یان لە ژێر سمەکانی بیفلیقێنێ. ناپلیۆن ڕواڵەتی گۆڕا و بە توندی ئەمری بە باکسر کرد کە واز لە سەگەکە بهێنێ. هەر لە گەڵ باکسر سمی لابرد سەگە بریندارەکە بە گێرەگێر ڕای کرد.

هـەرا و هوریا تەواو بـوو. چوار بەرازەکەش لە کاتێکدا کە لە ترسـانا دەلەرزین و لە ڕواڵەتیاندا نیشـانەی گوناهباریـان پێوە دیار بوو، چاوەڕێ بوون. ناپلیۆن پێی گوتن کە ڕاستیی کردەوە دزێوەکانیان بڵێن. ئەم بەرازانە هەر ئەو چوار بەرازە بوون کە لە سەر هەڵوەشاندنەوەی کۆبوونەوەی ڕۆژانی یەکشەممە لە لایەن ناپلیۆنەوە، نارەزایەتیان دەربڕیبوو. هەر چوار بەرازەکە دیانیان پیدا نا کە لەو کاتەوە سنۆباڵ دەرکراوە بە شێوەی نهێنی هەڵس و کەوتمان لەگەڵدا کردووە و لە ڕووخانی ئاشەکەشدا هاریکاریمان کردووە و بڕیاریشمان وا بوو کە مەزراکە ڕادەستی فریدریک بکەین. هەروەها گوتیان کە سـنۆباڵ بە شـێوەیەکی تاکە کەسـی پێی گوتووین کە زۆر لە مێژە، مۆرەی نهێنیی جۆنز بووە.

کاتێک بەرازەکان لە وتەکانیان بوونەوە بێ دوا کەوتن سەگەکان ورگیان درین و ناپلیۆنیش بە دەنگێکی بەرز گوتی ئاژەڵێکیتر ماوە کە شـتێکی بۆ گوتن هەبێ. ئەو سـێ مریشکە سپانیاییە کە بۆ باسی هێلکەکان هۆکاری ئاژاوەی مریشـکەکان بوون، هاتنە پێشـەوە و گوتیان کە سنۆباڵ لە کاتی خەودا خۆی پێ نیشان داون و ئەوانی فریو داوە کە لە فەرمانەکانی ناپلیۆن سـەرپێچی بکەن. ئەوانیش کوژران. لە پاشاندا قازێک هاتە پێش و گوتی کە لە کاتی خەرمان هەڵگرتنی سـاڵی ڕابردوودا شەش گوڵە گەنمی دزیوە و شـەو خواردوونی. لە دواییدا مەڕێک ڕاسـتی ئەوەی درکاند کە میزی لە ئەسـتێرە ئاوەکە کردووە و گوتیشـی کە ئەم کارەی بە هۆی زۆرە ملی

سنۆباڵەوە بوە. ئەوکات دوو مەڕی دیکە گوتیان بەرانێک لە گیان فیداکانی ناپلیۆنیان لە کاتی پشـــمیندا ئەوەندە هەڵبڕیوە تا مردووە. هەموویان هەر لەو شوێنەدا کوژران.

دیان پیانان بە ڕاستییەکان و تۆڵە سەندنەوە تا ئەو ڕادە درێژەی پێدرا کە لە لاشـــەی کوژراوەکان تەپۆڵکەیەک لە بەر دەم ناپلیۆندا دروست بوو. بۆنی خوێن هەموو شوێنێکی داگرت.

ئەم جۆرە دیمەنانە لە کاتی جۆنزەوە نەبیندرابوون.

کاتێک کار لە کار ترازا ئـــەو ئاژەڵانەی مابوونەوە، بێجگە لە بەرازەکان و ســـەگەکان، پێکەوە کرانە دەرەوە و لەو شوێنە ترسێنەرە دوور کەوتنەوە. هەموو هەراسان و پەرێشان بوون و نەیاندەزانی کە ئایا جینایەتی ئاژەڵەکان لە هاودەســـتی کردن لە گەڵ سنۆباڵ گەورەترە یان ئەو سزا بێبەزییانەی کە بینیان. پێشـــتر لەم دیمەنە خوێناوییانـــە و بەم ڕادە بێزارکەرەیان زۆر دیبوو، بەڵام بەڕای هەموویان ئەم ڕووداوەی دوایی کە لە نێوان خۆیاندا بوو لەوانی پێشـــتر دڵتەزێنتر و بێزارکەرتر بوو. لەو ڕۆژەوە کە جۆنز مەزراکەی بەجێ هێشـــتبوو تا ئەمڕۆ هیچ ئاژەڵێک ئاژەڵێکیتری نەکوشتبوو. تەنانەت مشـــکێکیش نەکوژرابوو. ئاژەڵەکان بەرەو ئاشە نیوەکارەکە ڕۆیشتن. کلوور، موریل، بنجامین، گاگەلەکە، مەڕەکان، قازەکان و مراوییەکان، یانی هەموو بێجگە لە پشـــیلەکە، کـــە پێش کۆبونەوەکە خـــۆی ون کردبوو، لە نزیک یەکترەوە دانیشـــتن بە جۆرێک کە دەتگوت پێویستیان بە گەرمی لەشی یەکتر هەیە. ماوەیەک هەموو بێدەنگ بوون. تەنیا باکسر بە پێوە ڕاوەستابوو و بە نیگەرانییەوە ڕاوێچکەی دەکرد و کلکە ڕەشـــە درێژەکەی لە پشـــتی خـــۆی دەدا و جار بە جاریش حیلکەیەکی کورتی لە ســـەر ســـوورمانەوە دەهات.

لە ئاکامدا گوتی: «هیچ ســـەرەندەری لێناکەم. هەرگیز باوەڕ ناکەم کە وەهـــا ڕووداوێک لە مەزراکەی ئێمە ڕوو بدات. بۆی هەیە کەم و کورتی لە خۆمانەوە بێ. تەنیا ڕێگا چارەیەک کە بە شـــتێک دەگات ئەوەیە کە دەبێ زیاتـــر هەوڵ بدەین. لە ئەمڕۆ بە دواوە مـــن بەیانیان یەک کاتژمێر زووتر لە خەو هەڵدەســـتم». بە هەنگاوە قورسەکانی بەرەو لای بەردەکان ڕۆیشت و دیسان بەردی کۆ کردنەوە و بردنی بۆ لای ئاشەکە. پاشان پشووی دا.

ئاژەڵەکان بێ ئەوەی وشـــەیەک بڵێن لە دەوری کلـــوور کۆ بوونەوە و خۆیان پێوە لســـکاند. لە سەر تەپۆڵکەکە زۆرینەی مەزراکەیان کە تا جادە سەرەکییەکە کێشـــرابوو، مەزرای وێنجەکە، دارستانە چکۆلەکە، ئەستێلی ئاوەکـــە، زەوییە کێڵدراوەکان کە بەرهەمە پڕ و ســـەوزەکانی گەنم و جۆی تێدا ڕوابوون و شـــیروانییە ســـوور ڕەنگەکانی خانووبەرەی ناو مەزراکە کە دووکەڵ لە لوولـــە کوورەکانی بەرز دەبـــووەوە، هەموویان دەدی. یەکێک لـــە ڕۆژە ڕووناکەکانـــی بەهار بوو. ســـەوزەڵانی و پەرژینـــەکان بە پرژانی تیشـــکی هەتاو بە سەریاندا، ڕەنگی زێڕینیان بە خۆوە گرتبوو. ئاژەڵەکان بە سەرســـوورمانەوە وەبیر خۆیان هێنایەوە کە بست بە بستی ئەم مەزرایە کە ئێســـتا بەو جۆرە دڵڕفێن و جوان نەبیندرابـــوو، ئی خۆیانە. کلوور چاوێکی بە دەور و پشـــتی تەپۆڵکەکەدا گێڕاو فرمێسک لە چاوەکانیدا قەتیس مان. گەر توانای دەربڕینی بیر و بۆچوونەکانی ببوایە، بە دڵنیاییەوە دەیگوت کە ئامانج لە دەرکردنی مرۆڤەکان ئەمە نەبوو.

مەبەســـت لەو ڕاپەڕینەی کە مێجری پیر تووەکەی لە مێشکی ئەواندا ناشتبوو، ترس و کوشتن نەبوو. ئەگەر بۆخۆی وێنەی داهاتووی بکێشایەتەوە، وێنەیەک بوو لە کۆمەڵێک ئاژەڵ کە برســـییەتی و لێدان دوو وشـــەی زۆر غەریبی ناو ئەو وێنەیە دەبوون. هەموو یەکســـان. هەر کەس بە پێی توانا

کاری دەکـــرد. توانا لایەنگری کەم هێـــزەکان دەبوو. هەر وەکوو خۆی کە لە شـــەوی وتەبێژییەکەی مێجرِدا جووچکە مراوییەکانی پاراســـت. بەڵام نەیدەزانـــی کە بۆچی کەوتوونەتە ڕۆژێکی وا کە کەس لە ترســـی ســـەگە درِنـــدەکان غیرەتی ڕادەربرِینی نییە و دەبێ لەت و پەت بوونی هاورِێکانی ببینێ و گوێ بیستی گێرِانەوەی خەیانەتەکانیان بێ. بیرۆکەی یاخی بوونی نەبوو. دەیزانی سەرەرِای هەموو ئەو شتانەی کە ئەمرِۆ بینیونی، ئێستا هەر لە سەردەمی جۆنز باشـــترن. ئەوەشی دەزانی کە گرنگترین کار پێشگرتن لـــە گەرِانەوەی مرۆڤە. دەیزانی کـــە دەبێ وەفادار بمێنێتەوە. زیاتر کار بکا. فەرمانەکان جێبەجێ بکا و ناپلیۆنیش وەک پێشـــەوایەک پەســـەند بکات. بەڵام ئامانجی هەموو ئەو ڕەنجانەی کە ئەو و هاورِێکانی کێشابوویان، ئەمە نەبوو. بۆ ئەمە نەبوو کە ئاشـــەکەیان دروســـت کردبـــوو. خۆیان دابووە بەر گوللـــەی جۆنز. بیرۆکەکانی کلوور ئەمانە بـــوون هەر چەند کە نەیدەتوانی بیاندرکێنێ.

لە ئاکامدا وای هەســـت کـــرد کە خوێندنەوەی ســـروودی ئاژەڵەکانی ئینگلیـــز تا ڕادەیەک دەتوانێ جێگری هەموو ئەو وشـــانەی بێ کە ناتوانێ بیهێنێتە زمان. هەر بۆیەش دەستی بە خوێندنەوەی سروودەکە کرد.

ئاژەڵەکانی دیکەش کە لە دەوری دانیشـــتبوون هاودەنگی بوون و سێ جـــار بە دوای یەکدا و بە یەکدەنگی تەواوەوە خوێندیانەوە، بەڵام هێواش و بە ســـۆز. هەرگیز ئەو سروودەیان بەو جۆرە بە سۆز نەخوێندبووەوە. تازە جاری سێهەمیان تەواو کردبوو کە سکوئیلەر لە گەڵ دوو سەگ گەیشتنە ئەوێ و دیاربوو شـــتێکی گرنگـــی بۆ گوتن پێبـــوو. ڕایگەیاند کە بە پێی فەرمانـــی هاورِێ ناپلیۆن، خوێندنەوەی ســـروودی ئاژەڵەکانی ئینگلیز لەم ڕێکەوتە بە دواوە قەدەغەیە.

ئاژەڵەکان رامان.

مورپیل هاواری کرد «بۆ؟»

سـکوئیلەر بە توونده‌ی گوتی: «هاوڕێ، بەم هۆیە کە چیتر پێویستمان پێی نییە. ئەمە سـروودی سەردەمی راپەڕینەکە بوو. ئێستاش کە راپەڕین بە بەهرە گەیشتووە و دوایین بەشەکەشی سزادانی خائینەکان بوو. دوژمن چ ناوخۆ و چ دەرەوە، تێکشـا. لەو سـروودەدا ئێمە ویستەکانی خۆمان بۆ رۆژگارێکی باشـتر و ژیانێکی خۆشتر رادەگەیاند و ئێستا بە هەر دووکیان گەیشتووین. چیتر ئەم سرووده مانای نییە!»

هەر چەند کە ئاژەڵەکان ترسابوون، بەڵام چەند دانەیان ویستیان دەنگی نارەزایەتـی خۆیان هەڵبڕن کە مەڕەکان بارەبارێ (چوارپێ باش و دوو پێ خراپ) یان دەست پێکرد و رێی هەموو باسێکیان بڕی.

بەم جۆرە چیتر سروودی «ئاژەڵەکانی ئینگلیز» نەبیسترا و بە جێی ئەو ماسی شاعیر شێعرێکی دانا کە سەربەندەکەی بەم جۆرە بوو.

قەڵای ئاژەڵان قەڵای ئاژەڵان.

هەرگیز لە منەوە زیانت پێناگات!

ئـەم سـروودە هەموو رۆژێکـی یەکشـەممە دوای هەڵدانـی ئاڵاکە دەخوێندرایـەوە، بـەڵام بەڕای ئاژەڵەکان نە وشـەکانی و نە ئاهەنگەکەی چێژی سرودی «ئاژەڵەکانی ئینگلیز»ی نەبوو.

□

# وەرزی ٨

چەند ڕۆژ دوای کوشـــتارەکە ئاژەڵەکان بیریان هاتەوە یان وایان بیرکردەوە کـــە لەبیریانە بڕگەی شەشـــی فەرمانەکە دەڵێ هیـــچ ئاژەڵێک بۆی نییە ئاژەڵێکیتر بکوژێت. هەرچەند کە کەس نەیدەویست ئەم شتە لای بەرازەکان و ســـەگەکان بدرکێنێ، بەڵام وایان هەست دەکرد کە کوشتنی ئاژەڵەکان دژی فەرمانەکە بووە.

کلوور داوای لە بنجامین کرد کە بڕگەی شەشی فەرمانەکە بخوێنێتەوە، بـــەڵام بنجامیـــن وەک هەمیشـــە گوتی کە خـــۆی لەم جـــۆرە کارانەدا هەڵناقورتێنـــێ، هەر بۆیـــە داوای لە موریل کرد. موریـــل فەرمانەکەی بۆ خوێندەوە کە بەم جۆرە بوو.

«هیچ ئاژەڵێک بۆی نییە بە بێ هۆ ئاژەڵێکی تر بکوژێت»

بەشـــێوەیەک لە شێوەکان دوو وشـــە لە ناو فەرمانەکەدا بۆ ئاژەڵەکان تـــازە بوو! بە هـــەر جۆرێک بوو وای لـــێ حاڵی بوون کـــە کارێک دژ بە فەرمانەکە نەکراوە. هەروەها بە باشـــی دەیانزانی کە کوشتنی ئەو ناپاکانەی

کە هاوپەیمانی سنۆباڵ بوون، بە بێ هۆکار نەبووە.

ئەو ســـاڵە ئاژەڵەکان لە چاو ساڵی پێشـــوو، زۆرتریان کار کرد. دروست کردنەوەی ئاشەکە بە تایبەت کە پانایی دیوارەکە دوو بەرابەر ببوو و تەواو کردنیشـــی لەکاتی دیاریکراودا ســـەرەڕای کاری ڕۆژانەی مەزراکە کارێکی قورس بوو.

زۆر ڕۆژ ئاژەڵـــەکان وایاندەزانی کە لە چاو کاتی جۆنزەوە چەند کاتژمێر زۆرتر ئیشیان کردووە و کەمتریشیان خواردن پێدراوە.

بەیانی ڕۆژانی یەکشەممە سکوئیلەر لە ڕووی لاپەڕێکەوە کە بە یەکێک لە چمکەکانی لە پێش خـــۆی ڕایدەگرت، بۆی دەخوێندنەوە کە بەروبووم دوو ئەوەندە، سێ ئەوەندە و تەنانەت پێنج ئەوەند بووە.

ئاژەڵەکان هۆکارێکیان نەبوو کە باوەڕ بە قســـەکانی نەکەن. بەتایبەت ئەوانـــەی کە ژیانی پێش ڕاپەڕینەکەیان وەبیـــر نەدەهات. بەڵام زۆربەی ڕۆژ وایـــان حەز دەکرد، کەمتریان قســـە بۆ بکـــەن و زیاتریان خواردن بدەنـــێ. لەم ڕۆژانـــەدا فەرمانەکان لە لایەن ســـکوئیلەر و بەرازێکیترەوە ڕادەگەیەنران. ناپلیـــۆن تەنانەت دوو حەوتە جارێکیش لە کۆبوونەوەکاندا نەدەبینرا. کاتێکیش دەردەکەوت ســـەرەڕای ســـەگەکان، کەڵەشێرێکی بچووکـــی ڕەش وەک شـــەیپوورچی لـــە پێشـــییەوە دەڕۆیـــی و پێش قســـەکردنی ناپلیۆن بانگێکی بچووکی دەخوێند. دەیانگوت ناپلیۆن لە ناو خانووبەرەی مەزراکە، لە شوێنێکی جیاواز لە ئەوانیتر دەژی و ژەمەکانیش بە تەنیا و لە ناو دەفری چینی کە لە چێشـــتخانەکەدا بوون، دەخوا. دوو سەگیش بۆ خزمەت کردن لە لای دەمێننەوە. هەروەها وا بڕیار درا کە لە شـــەوی لەدایـــک بوونـــی ناپلیـــۆن وەک دوو ســـاڵیادەکەی تـــر تەقە بکرێ.

ناپلیۆن، ئیتر وەک جاران بە شـێوەیەکی سـاکار بانگ نەدەکرا. ناوی ئەویـان بە فەرمی، ڕێبەری ئێمە هاوڕێ ناپلیـۆن، دەهێنا و بەرازەکانیش هەوڵیـان دەدا بە وشـەگەلی وەک؛ باوکی ئـاژەڵان، دوژمنی مرۆڤەکان، یاریدەری مەڕەکان و فریادڕەسی باڵندەکان ناوی بهێنن.

سکوئیلەر لە وتەکانیدا فرمێسکی هەڵدەڕشتن و لە مەڕ کارزانی ناپلیۆن و دڵ ڕەحمی و ئەوین و خۆشەویستی ئەو بۆ ئاژەڵەکان بە تایبەت ئاژەڵانی بێبەشی مەزراکانی دەور و پشت دەدوا.

وا ڕاهاتبـوون کـە هەر کارێکی سـەرکەوتووانە و پێشـهاتێکی باش بلکێنن بە ناپلیۆنەوە. زۆر جاران دەبیسترا کە مریشکێک بە یەکی دیکەی دەگوت: «لە ژێر سایەی کارگێڕی ژیرانەی ڕێبەرمان هاوڕێ ناپلیۆن من لە ماوەی شـەش ڕۆژدا پێنج هێلکەم کردووە!» یان دوو گاجووت کە لە ئاوی دۆڵاوەکەیان دەخواردەوە، دەیانگوت: «بە هۆی ڕێبەرایەتی هاوڕێ ناپلیۆنەوە ئاوەکە سارد و شیرین بووە!»

هەستی بە کۆمەڵی قەڵاکە لە شیعرێکی «مینی ماس»دا کە بە هاوڕێ ناپلیۆنی هەڵگوتبوو، بە جوانی دەبینرا.

چاوە گەشەکانت کە وەک تیشکی ڕۆژ
گەرمایـی ئەدا بـە عـەرز و جیهان
کـە ئەو نیگایـەت دەگاتە سـەر من
گـەرم دادێـم و دەڵێـم بـە زوبان
سەرچاوەی خۆشی و هاوڕێی بێکەسان
خەمخـۆری هەتیـو، یاریـدەی ژنان
هاوڕێ ناپلیـۆن ڕۆحمان بـە قوربان
هاوڕێ ناپلیـۆن ڕۆحمان بـە قوربان

ئێمـــە دەخەوین بێ خەم لە شـــەودا
زگـــی ئێمـــە تێـــر ، تۆ برســـی و باگا
لە ســـایەی تۆیە خۆشـــی ئـــەم ژینە
هـــەر کـــەس وا ناڵـــێ بڵـــێ بیبینـــە
کێیە پێی داوین ئەم خواردنە خۆشـــە
ئێمـــە ئاســـوودە و ئـــەو بە پەرۆشـــە
هاوڕێ ناپلیـــۆن ڕۆحمان بـــە قوربان
هاوڕێ ناپلیـــۆن ڕۆحمان بـــە قوربان
گـــەر بزەڵەیەکـــم پێ ببەخشـــێ خوا
پێـــش ئەوەی زل بێ و هێز پەیدا بکا
لـــە بـــەردەم تـــۆدا ســـتایش دەکا
دەڵێ ســـوێندم بـــە خـــودای گەورە
هەتـــا من بژیـــم لەم چـــەرخ و دەورە
هاوڕێ ناپلیـــۆن ڕۆحمان بـــە قوربان
هـــاوڕێ ناپلیۆن ڕۆحمان بـــە قوربان.

ناپلیۆن ئەم شـــێعرەی پەســـەند کرد و ئەمری کرد کە لە تەنیشت حەوت فەرمانەکە لە ســـەر دیوارە پانەکە بنووســـرێتەوە و لە سەر نووسراوەکەوە وێنەکانی ئەو کە ســـکوئیلەر بە ڕەنگی سپی کێشابوونیەوە هەڵواسرێن. لەم ماوەیەدا ناپلیۆن بە هۆی ویمپرەوە دەستی دابووە مامەڵێکی گەورە لەگەڵ فریدریک و پێل کینگتن. دار و موورەدارەکان هێشـــتا نەفرۆشرابوون. زیاتر فریدریک خوازیاری کڕینیان بوو، بەڵام نرخێکی وای لەسەر دانەنابوون کە هەڵگری بێت.

ئێســـتاش لە ناو ئاژەڵەکاندا باو بوو کە دەگوترا فریدریک و دەســـت و

پێوەندەکـــەی نیازی ئاژاوەگێڕیان هەیە و دەیانهەوێ هێرش بکەنە ســـەر قەڵاکە و ئەو ئاشـــەش وێران بکەن کە ببووە هۆی چاوچنۆکیان. ئەوەشیان بۆ سەلمابوو کە سنۆباڵ ئێستاش هەر لە پێنج فیلْد لە کەمیندایە.

لە ناوەڕاســـتی هاویندا ئاژەڵەکان بە دیان پێداناني ســـێ مریشک بەو ڕاستییەی کە بۆ کوشتنی ناپلیۆن بە دەسکیسی سنۆباڵ دەستیان هەبووە، سەرســـام بوون. مریشـــکەکان بێ دواکەوتن لە سێدارە دران و ئاگاداری و وریا بوونێکی زیاتر بۆ پاراســـتنی گیانی ناپلیۆن بەڕێوە چوو. شـــەوانە چوار ســـەگ لە چوار سووچی قەرەوێڵەکەی پاسیان دەدا و بەرازێکی گەنجیش بە ناوی «پێکتای» پێشـــتر لە خواردنەکەی دەخوارد بۆ ئەوەی دڵنیابن کە ژەهری تێنەکراوە.

هـــەر لەو ماوەیەدا بوو بڵاو بووەوە کـــە ناپلیۆن دارەکانی بە ئاغای پێل کینگتن فرۆشـــتووە و مامەڵەی گۆڕینـــەوەی کاڵا لە بەینی قەڵای ئاژەڵان و فاکـــس وود بەڕێوە دەچێ. هەر چەند کە پێوەندی نێوان ناپلیۆن و پێل کینگتن لەلایەن ویمپرەوە بوو، بەڵام ئەم پێوەندییە تا ڕادەیەک دۆســـتانە بـــوو. ئاژەڵەکان بە هۆی مرۆڤ بوونـــی پێل کینگتن متمانەیان پێی نەبوو، بەڵام ئەویان لە فریدریک زیاتر دەویســـت کە لێی دەترســـان و ڕقیان لێی بوو. کاتێک هاوین ڕۆیی و وەرزی پاییز هات، ئاشـــەکە ڕوو لە تەواو بوون بوو. پروپاگەندەی هێرش هێنانی خائینەکان لە زیادبووندا بوو.

دەگوترا کە فریدریک دوو پیـــاو و چەکدارێکی هەیە. لەگەڵ دادوەر و سەرۆک شـــارەوانیش چاوپێکەوتنی کردووە بۆ ئەوەی کاتێک بەڵگەنامەی خاوەنـــداری مەزراکـــەی بە چنگ هێنـــا، لۆمە نەکـــرێ. هەروەها هەواڵی ترسێنەر لە ئازار و ئەشکەنجەی ئاژەڵەکان لە لایەن فریدریکەوە دەبیسترا. دەگوترا ئەســـپێکی پیری تا ئاستی مردن ئازار داوە و گاجووتەکانی برسی

هێشـــتووەتەوە و سەگێکیشـــی بە زیندوویی لە تەندوورەکە خستووە و بۆ ڕابواردنـــی خۆی کەڵەبابەکانی بە شـــەڕ داوە، بە شـــێوەیەک کە تیغی بە پەنجەکانیانەوە بەستۆتەوە بۆئەوەی یەکتری پێ کوڵەوار بکەن.

ئاژەڵەکان لەوەی کە لەگەڵ هاوڕێکانیان بەو شـــێوەیە هەڵس و کەوت دەکرێ، خوێنیان گەرم دەبوو و بە نەڕەنەڕ و هاوار کردن دەیانویســـت کە هێرش بکەنە سەر پێنج فیڵد و مرۆڤەکان لەوێ ڕاو بنێن و ئاژەڵەکان ڕزگار بکەن. بەڵام سکوئیلەر ئەوانی ئامۆژگاری دەکرد و هێمنی دەکردنەوە و پێی دەگوتن کە لە هەر چەشـــنە ئاکارێکی بێ بیرکردنەوە و هەڵەشـــە دووری بکەن و باوەڕیـــان بە کارامەیی هاوڕێ ناپلیۆن هەبێت. ســـەرەڕای ئەمانە هەســـتی دژ بە فریدریک لە زیادبووندا بوو. بەیانییەکی یەکشەممە ناپلیۆن هاتە عەممارەکە و گوتی کە ئەو هیچ کات نیازی فرۆشـــتنی دارەکانی بە فریدریـــک نەبووە و ئاماژەی بەوەش کرد کە مامەڵە کردن لەگەڵ پیاوێکی پەستی وەک ئەو لە شان و شکۆی ئەودا نییە. کۆترەکان کە تا ئەو کاتەش بۆ هەڵگیرساندنی گڕی ڕاپەڕین و تۆڵە بۆ مەزراکانیتر دەنێردران، لە چوون بـــۆ فاکس وود ڕێگریان لێکرا و بەجێی دروشـــمی نەمـــان بۆ مرۆڤایەتی دروشـــمی نەمان بۆ فریدریک دەگوترایەوە. هەر لە ئاخر و ئۆخری هاویندا بوو کە پیلانێکیتری ســـنۆباڵ ئاشـــکرا بوو. بەرهەمی گەنمەکە پڕ ببوو لە بژار و ڕوونیش بووەوە کە ســـنۆباڵ لە شەودا تۆوی بژارەکەی لەگەڵ تۆوی گەنمەکە تێکەڵ کردووە. قازێکی نێر کە بڕێکی زانیاری لە ســـەر پیلانەکە هەبوو و لە لای سکوئیلەر دیانی بە تاوانەکەیدا نابوو، بە خواردنی کارگێکی گولانە خۆی کووشـــت. ئاژەڵەکان وایاندەزانی کە سنۆباڵ نیشانی ئازایەتی ئاژەڵـــی پلە یەکی پێدرابـــوو، بەڵام بۆیان دەرکەوت کە ئـــەم بابەتە تەنیا پڕوپاگەندەی ســـنۆباڵ بووە و نە تەنیا نیشـــانی ئازایەتی پێنەدراوە، بەڵکوو

بەهــۆی ناکارامەیی و بێکەڵک بوونی لە شــەڕی گادانەکەدا لۆمە کراوە و کەوتۆتــە بەر تانە و توانجی هاوڕێکانی. ئاژەڵەکان بە بیســتنی ئەم هەواڵە جارێکیتر مات و سەرسام بوون. بەڵام سکوئیلەر دیسان توانی باوەڕیان پێ بهێنێ کە مێشکیان توانای ئەوەی نییە کە ئەو ڕۆژانە باش وەبیر بهێننەوە. بە هەوڵ و تێکۆشــانێکی زۆرەوە لە پاییــزدا و لە کاتی هەڵگرتنی خەلە و خەرمان بوو کە دروســت کردنی ئاشــەکە کۆتایی پێهــات. کاری دانان و دامەزرانی ماشــینەکان مابووەوە. واش بڕیار درا کــە ویمپر بۆ کڕینی ئەو کەرســتانە لە هەوڵدا بێت. ســەرەڕای هەموو ئەو کۆسپ و تەگەرە و کەم ئەزموونــی و کۆن بوونی ئامێرەکان و خەیانەتی ســنۆباڵ، کارەکە لە کاتی دیاریکراودا کۆتایی پێهات.

هەرچەنــد کە ئاژەڵــەکان ماندوو بوون، بەڵام بەشــانازییەوە بەدەوری شــاکارەکەی خۆیاندا دەخولانەوە و لە بــەر چاویاندا زۆر جوانتر لە جاری پێشــوو دروســت کرابووەوە. ئەمجــارە جگە لە تەقەمەنی، هیچ شــتێک نەیدەتوانی بیرووخێنێ. ئاژەڵــەکان بیریان لەوە دەکردەوە کە چۆن و لە چ بار و دۆخێکدا کاریان کرد و بە ســەر چ کەند و لەندێکدا ســەرکەوتوون. هەروەها کاتێک ئەو ڕۆژەیان دەهێنایە بەرچاو کە پەرەکانی ئاشەکە وە گەڕ دەکەون و ئاسانکاری لە ژیانیاندا پێش دێ و دەکەونە ئاسایشەوە، ماندوویان دەحەسایەوە و بە دەوری ئاشــەکەدا ڕایاندەکرد و هاواری شادمانیان بەرز دەبووەوە.

ناپلیۆن بۆ خۆی و چوار سەگی پاسەوان و کەڵەبابە گەنجەکە سەردانی ئاشــەکەی کرد و پیرۆزبایی لە ئاژەڵەکان کرد و ڕایگەیاند کە ئاشــەکە بە ناوی ئاشی ناپلیۆن ناو دەنرێ!

پــاش دوو ڕۆژ ئاژەڵەکان بــۆ کۆبوونەوەیەکی نائاســایی لە تەویلەکە

بانگهێشـــت کران. کاتێک کـــە ناپلیۆن ڕایگەیاند دارەکانـــی بە فریدریک فرۆشـــتووە و واگۆنێک بۆ ڕاگواســـتنی دارەکان دێتـــە مەزراکە، هەموو لە جێی خۆیاندا وشـــک بوون. ڕاســـتی کارەکە ئەوە بوو کە ناپلیۆن لە هەموو ئەو کاتانەی کە وای نیشـــان دەدا لەگەڵ پیل کینگتن دۆســـتە، لە ژێرەوە خەریکی دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ فریدریکدا بووە.

پێوەندی لەگەڵ فاکس وود پچڕا و قســـەی ڕەق و ناخۆش نێردران بۆ پیل کینگتن. بە کۆترەکان گوترا چیدی نەچن بۆ پێنج فیڵد و دروشـــمی «نەمان بۆ فریدریـــک» بگۆڕدرێ بۆ «نەمان بۆ پیـــل کینگتن». ناپلیۆنیش ئاژەڵەکانـــی دڵنیا کـــردەوە کە چیرۆکـــی هێرش کردن بۆ ســـەر قەڵای ئـــاژەڵان پڕوپاگەندە بووە و لە گێڕانەوەی بەدڕەوشـــتیی فریدریک لەگەڵ ئاژەڵەکان زێدەڕۆیی کراوە. بۆی هەیە ئەم پڕوپاگەندانەش لەلایەن سنۆباڵ و بەکرێگیراوەکانیەوە بووبێت. هەروەها ئاشکرا بوو کە سنۆباڵ لە پێنج فیڵد نییـــە و هەرگیز لە تەواوی تەمەنی خۆیدا بۆ جارێک پێی نەخســـتۆتە ئەو شوێنەوە و بەڵکوو لە خۆشی و نازدا لە فاکس وود ژیان بەسەر دەبات و لە ڕاستیشدا ماوەی چەند ساڵێکە چڵکاو خۆری پیل کینگتنە.

بەرازەکان لەوەی کە ناپلیۆن توانیبووی کڵاو ســـەر پیل کینگتن بنێت و بە دارڕشـــتنی پیلانێک لە ڕێـــی دۆســـتایەتییەوە دوازدە لیرە بە نرخی دارەکان زیاد بکات، کەیف خۆش بوون. ســـکوئیلەر دەیگوت ســـەرووەری و باشـــیی ناپلیۆن لەوەدایە کە بڕوای بە کەس نییە و ئەم بێ بڕواییەشی لە ئاســـت فریدریک نیشان داوە. فریدریک دەیویست بە جێی دارەکان لاپەڕە کاغەزێکمان بداتێ کە پێـــی دەگوترێت چەک. بەڵام ناپلیۆنی ژیر ئەمەی پەسەند نەکردووە و گوتوویەتی کە دەبێ تەواوی پارەکە پێنج لیرەیی بێت و پێش ڕاگوێســـتنی دارەکان هەر لەو شـــوێنە فریدریک هەموو پارەکەی

داوە و پارەکـــەش بـــەو ڕادەیە بوو کە بتوانرێ ئامێرەکانی ئاشـــەکەی پێ بکڕدرێ. لەم ماوەیەدا نیوەی دارەکانیان ڕاگواست. دوای ئەوەی هەموویان گواســـتەوە، کۆبوونەوەیەکی تایبەت لە تەویلەکـــەدا پێکهات تا ئاژەڵەکان لیرەکانی فریدریک ببینن. ناپلیۆن بە پێکەنینەوە کە نیشانەی سەرکەوتن بوو و بە جۆرێک کە هەر دوو نیشانەکەی بە سەر سینگیەوە هەڵواسیبوو، لە سەر جێی سازکراو لە کا و بەڵمە گیا لە سەرووی سەکۆکەوە پاڵی دابووەوە. پارەکە لە تەنیشتییەوە لە ناو کاسەیەکی چینی بە ڕێکی دانرابوون.

ئاژەڵەکان دانەدانە و بەهێواشـــی بە بەردەم کاسە پارەکەدا ڕادەگوزەران و بە وردی ســـەیریان دەکرد. باکســـر بە لمبۆزەکـــەی بۆنی پێوە کردن و زرینگەزرینگی لێهێنان.

پاش سێ ڕۆژ هاتوهاوارێکی سەیر بەرپا بوو. ویمپر کە ڕەنگی پەڕیبوو، بە توندی بە سواری دووچەرخەکەی هات. دووچەرخەکەی لە حەوشەکەدا دانا و یەک ڕاست چوو بۆ لای خانووبەرەکە.

دوای ماوەیەکی کورت دەنگێکی تووڕە لە ناو ماڵەکەوە بیسترا. هەواڵی ڕووداوەکـــە وەک تۆپ دەنگی دایـــەوە. پارەکە تەزویر و غەشـــدار بووە و فریدریک دارەکانی بە هیچ کڕیوە. ناپلیۆن ئاژەڵەکانی بانگ کرد و فەرمانی کوشتنی فریدریکی دەرکرد. گوتی کە دوای دەستگیر کردنی بە زیندوویی دەیکوڵێنین. هەروەها ئاژەڵەکانی ئاگادار کردەوە کە دەبێ چاوەڕێی خراپتر بـــن. کێ نالێ کە فریدریک و پیاوەکانی لە کتوپڕدا ئەو هێرشـــە دەســـت پێناکەن کە زۆر لە مێژە چاوەڕێی دەکرێ.

لە هەموو ڕێگاکانی قەڵاکە پاســـەوانیان دانـــا و هەروەها چوار کۆتر بە پەیامی ئاشـــتی و بە هیوای دەســـت پێکردنەوە پێوەندی باش لەگەڵ پیل کینگتن ڕەوانەی فاکس وود کران.

بەیانی ڕۆژی دوایی هێرشـــەکە دەســـتی پێکـــرد. ئاژەڵەکان خەریکی قاوەڵتـــی خواردن بوون کـــە فریدریک لەگەڵ دەســـت و پێوەندەکانی لە دەروازە پێنج پاشـــکۆڵییەکەوە هاتنە ناو مەزراکەوە. ئاژەڵەکان بە ئازایەتی تەواوەوە هێرشیان برد، بەڵام ئەمجارەیان وەک شەڕی گادانەکە بە ئاسانی سەرکەوتنیان بەدەســـت نەدەهێنا. مرۆڤەکان پانزدە کەس بوون و شەش تفەنگیـــان پێبوو. هەر لەگەڵ ئاژەڵەکان گەیشـــتنە قامچی، بە تفەنگەوە، تەقەیان لێکردن.

ئاژەڵەکان بڕســـتی خۆ ڕاگریان نەبوو. ســـەرەڕای هەوڵ و تێکۆشـــانی ناپلیۆن و باکسر، پاشەکشەیان کرد و چەند دانەشیان لێ بریندار بوو.

هەموو لە ناو خانووەکەدا کۆبوونەوە و بە وریاییەوە لە قڵشـــتی دیوار و درزی دەرگاکانەوە سەیری دەرەوەیان دەکرد. هەموو لەوەڕگەکە و ئاشەکە بەر دەســـت دوژمن کەوتبوو. لەو کاتـــەدا ناپلیۆنیش نەیدەزانی کە چ بکا. کلکـــی قیت ببوو. بێ ئەوەی وشـــەیەک بدرکێنێ ســـەر و ژووری دەکرد. هەموو چاویان لە فاکس وود بڕیبوو کە ئەگەر پیل کینگتن و پیاوەکانی بە دەنگیانەوە بێن، ئێستاش ئەگەری سەرکەوتن هەبوو. بەڵام ئەو چوار کۆترە گەڕانەوە و یەکیان پەڕەیەکی پێبوو. بە قەڵەمی دار لە ســـەری نووسرابوو: «با چاوت کوێر بێ!»

فریدریک و پیاوەکانی لە دەوری ئاشـــەکە ڕاوەستان و لە ئاژەڵەکانیان دەڕوانی. ورتەورتێکی ترســـێنەر بەرز بووەوە. دوو کەس لە پیاوەکان، پیک و نوێڵ بە دەستەوە دەیانویســـت ئاشەکە بڕووخێنن! ناپلیۆن هاواری کرد: «مەترســـن هاوڕێیان. شتی وا ناکرێ. دیواری ئاشەکە لەوە ئەستوورترە کە بە پیک و نوێڵ تەنانەت لە ماوەی حەفتەیەکدا بڕووخێت».

بەڵام بنجامین کـــە هەڵسوکەوتی مرۆڤەکانـــی دەبینی و دەیدی کە

ئەو دوو کەســـە خەریکی هەڵکەندنی چاڵێکن لە نزیک ئەستوونی ئاشەکە، لمبۆزە درێژەکەی بە شێوەیەک کە گاڵتەجاڕی پێوە دیاربوو، هەڵقرچاندبوو و گوتی: «بیرم لەمە دەکردەوە. نابینن چی دەکەن؟ ماوەیەکیتر چاڵەکە پڕ دەبێت لە تەقەمەنی!»

ئاژەڵەکان بە ترســـەوە چاوەڕوان بوون. ئیتـــر مەجالی چوونە دەرەوە و هێرش بردن نەمابوو. دوای چەند خولەک بینیان کە مرۆڤەکان هەر یەک بە لایەکدا ڕادەکەن و پاشان دەنگێکی وا هات کە لەوانە بوو گوێ کەڕ بکا. کۆترەکان فڕین و ئاژەڵەکانیش بێجگە لە ناپلیۆن، هەموو بە سکەوە خۆیان بە گڵەکەدا مڵاســـە کرد. کاتێک هەستانەوە پەڵەیەکی گەورە لە دووکەڵی ڕەش دەور و پشـــتی ئاشـــەکەی داگرتبوو. وردەوردە با دووکەڵەکەی ڕادا. چیتر ئاشێکی لێنەبووا!

بـــە بینینی ئەم دیمەنە، ترس و بێ هیوایی ماوەیەک لەوە پێش ڕۆیی و ئاژەڵەکان بە نیازی تۆڵە ســـەندنەوە بێ ئەوەی چاوەڕێی فەرمان بن، بە کۆمەڵ هێرشیان برد بۆ پێشەوە و بەرەو دوژمن ڕۆیشتن. گوێیان نەدا بەو گوللانەی بە ســـەریاندا دەباری. شەڕێکی قورس دەستی پێکرد. مرۆڤەکان تەقەیان دەکرد و کاتێک ئاژەڵەکان نزیک دەبوونەوە بە دار و پۆستاڵە ڕەق و قورسەکانیان هێرشیان دەبرد.

یەک گا، سێ مەڕ و دوو قاز کوژران. ئەوانیتریش هەموو بریندار بوون. تەنانەت ناپلیۆنیش کە لە پشت سەریانەوە شەڕەکەی بەڕێوە دەبرد سەری کلکی بە ساچمە پێکرا.

مرۆڤەکانیش بێ هەڵامەت دەر نەچوون. ســـەری ســـێ کەســـیان بە سمەکانی باکسر شکا و ورگی یەکیشیان بە شاخی گاجووتێک دڕا. جسی و بلۆبالیش شەڵواری کەســـێکیان دادڕیبوو. کاتێک نۆ سەگەکەی ناپلیۆن

کە لە بن پەرژینەکانــدا پەنایان گرتبوو، بە حەوتەحەوت لە دەور و بەری مرۆڤەکان سەوز بوون، ترس هەموویانی داگرت و بینییان کە مەترسی ئەوە هەیە کە دەوریان بگیرێ.

فریدریــک فەرمانی بە پیاوەکانی کرد کە تا درەنگ نەبووە ڕاکەن. پاش ماوەیەکی کورت دوژمنی نەوێر بە تێکشکاوی پاشەکشەی کرد. ئاژەڵەکان ڕاویان نان و بە چەند لەقە، ئاخر کەســیان لە ناو پەرژینە چقڵاوییەکانەوە وەدەرنان.

ســەرکەوتبوون، بەڵام ماندوو و خوێناوی! هێواش هێواش و شەلەشەل بــەرەو مەزراکە ڕێکەوتن. بــە بینینی تەرمی هــاوڕێ گیانبەختەکانیان، بڕێکیان هاتنە گریان.

لەو شوێنەی کە پێشتر ئاشەکەی لێبوو، بە بێدەنگی و دڵ نیگەرانیەوە ڕاوەستان. ئاشەکە بە تەواوی لەناو چووبوو! ئاسەوارەکەی لە هەموو لایەک بڵاو ببووەوە. هیچ شــتێکی لەسەر یەک نەمابوو. تەنانەت ئەستوونەکانیش ڕووخابوون. ئەم جارەیان نەیان دەتوانی لە کەرســتەی ئاشــە ڕووخاوەکە کەڵک وەربگرن. تەوژمی تەقینەوەکە ئەوانی ئەوەندە دوور خســتبووەوە کە هەست نەدەکرا ئاشی لێبووە!

کاتێک ئاژەڵەکان لە خانووبەرەکە نزیک بوونەوە، سکوئیلەر کە بێ هیچ هۆیەک لە ماوەی شــەڕەکەدا ون ببوو، لــە کاتێکدا کە کلکی بە خێرایی هەڵدەســووڕاند و زەردەخەنەیەکی لە سەر لێو بوو، بە تەقڵەغار بەرەو لای ئەوان هات. لەو کاتەشــدا ئاژەڵەکان دەنگی تەقەی تۆپێکیان بیســت کە لەلای خانووەکەوە هات.

باکسر لە هۆکاری تەقەکەی پرسی و سکوئیلەریش لە وەڵامدا گوتی کە جێژنی سەرکەوتنمان گرتووە!

باکسەر کە لە خوێن ئەنیشکەکانی دەتکا وناڵەکانی کەوتبوون و یەکێک لە سمەکانی قڵەشابوو و دوازدە ساچمەش لە قاچیدا بوون بە سەرسوورِمانەوە پرسی، کام سەرکەوتن؟!

سکوئیلەر: «چۆن کام سەرکەوتن، هاورِیٚ؟ ئەی ئەوە نییە ئێمە دوژمنمان لە خاکەکەمان، خاکی پیرۆزی قەڵای ئاژەڵان، راو ناوە!»

باکسەر: «بەڵام ئاشەکەمانیان وێران کرد. دووساڵی تەواو رەنجمان بۆ کێشا».

سکوئیلەر: «جا ئەمە کەی گرنگە؟ ئاشێکیتر ساز دەکەین. گەر بمانهەوێ ئەتوانین شەش ئاش دروست بکەین. هاورِێ تۆ ناتوانی بە گەورەیی ئەو ئیشە بزانی کە کردوومانە. هەر ئەم زەوییەی کە ئێستا لە سەری راوەستاوین، لە ژێر دەسەڵاتی دوژمندا بوو، بەڵام ئێستا لە سایەی رێبەرایەتی هاورِێ ناپلیۆنەوە بست بە بستمان ستاندۆتەوە».

باکسەر: «کەواتە ئێمە ئەو شتەمان ستاندۆتەوە کە پێشتر خاوەنی بووین!؟»

سکوئیلەر: «بەڵێ مانای سەرکەوتنیش هەر ئەمەیە».

ئاژەڵەکان بە شەلەشەل چوونەوە ناو حەوشەکە. ساچمەکان لە ژێر پێستی باکسەردا، ئێش و ئازارێکی زۆریان هەبوو. ئەو هەر لە ئێستاوە بەر لە هەموو شت بیری لە دروست کردنەوەی ئاشەکە دەکردەوە و لە دونیای خەیاڵی خۆیدا، خۆی بۆ کار و تێکۆشان ئامادە دەکرد، بەڵام بۆ یەکەم جار بیری لەوەش کردەوە کە تەمەنی لە یازدە ساڵ تێپەرِ بووە و چیتر ماسوولکەکانی هێزی جارانیان نەماوە.

بەڵام کاتێک ئاژەڵەکان، ئاڵا سەوزەکەیان بە شەکاوەیی دی و جارێکیتر گوێیان لە دەنگی تەقەی تۆپ بوو کە سەرجەم حەوت تۆپ تەقێندرا و

گوێ بیستی وتەکانی ناپلیۆن بوون کە باسی لە ئازایەتی ئەوان دەکرد و پێی هەڵدەگوتن و پیرۆزبایی لێدەکردن، وایان هاتە بەرچاو کە بەڕاستی سەرکەوتنێکی گەورەیان بە دەست هێناوە.

بۆ بە خاک سپاردنی شەهیدەکان مەراسیمێکی بەشکۆ گیرا. باکسر و کلوور عارەبانەیەکیان لە جیات تەرم کێش ڕادەکێشا و ناپلیۆنیش بۆخۆی لە پێشیانەوە دەڕۆیی.

جێژنەکەش دوو ڕۆژی تەواوی خایاند. بەستە و گۆرانی زۆر وترانەوە و قسەی زۆر کران و تۆپ تەقێندران و بە هەر ئاژەڵێک یەک سێو و بە هەر باڵندەیەک لاوێچێک دانەوێڵە و بە هەر سەگێکیش سێ بیسکویت بە دیاری درا و ڕاگەیەنرا کە شەڕەکە بە ناوی «شەڕی ئاشەکە» بناسرێت. ناپلیۆن نیشانەیەکی تری بە ناوی نیشانی ئاڵای سەوز داهێنا و پێشکەشی کرد بە خۆی، و چیرۆکی داخداری پارە تەزویرەکان بە هۆی ئەو خۆشییەوە لە بیر چووەوە.

چەند ڕۆژ دوای ئەم ڕووداوە بوو کە بە هۆی بەرازەکانەوە سندوقێکی پڕ لە ویسکی کە لە ژێرخانەکەدا مابووەوە و لە ڕۆژی گرتنەکەیدا کەس بایەخی پێ نەدابوو، دۆزرایەوە. شەوی دوای ئەو ڕۆژە دەنگی گۆرانی لە ماڵەکەوە دەبیسترا. بەوپەڕی سەرسووڕمانەوە ئاهەنگی سروودی ئاژەڵەکانی ئینگلیز لەگەڵ ئەو ئاهەنگانە تێکەڵ ببوو.

لە دەور و بەری نۆی شەودا هەموو بە ڕوونی بینیان کە ناپلیۆن لە کاتێکدا کە کڵاوە کۆنەکەی ئاغای جۆنزی لەسەرکردووە، لە پشت ماڵەکەوە هاتە دەرەوە و بە گورجی بە حەوشەکەدا ڕایکرد و دیسان چووەوە ناو ماڵەکە.

بەڵام بەیانی دوایی، بێدەنگی خانووەکەی داگرتبوو. تەنانەت یەک

بەرازیش لە جوولاندا نەبوو. سەر لە بەیانی سەر و سەکوتی سکوئیلەر پەیدا بوو کە بە هێواشـــی دەڕۆیی. چاوەکانی بێ شەوق بوون و کلکی بە دوایدا شـــۆڕ ببووەوە. بە تەواوی دیاربوو کە نەخۆشە. ئاژەڵەکانی کۆکردەوە و پێی گوتن کە هەواڵێکی ناخۆشی پێیە. هاوڕێ ناپلیۆن لە سەرەمەرگدایە.

قیژە و زریکەی ئاژەڵەکان بەرز بووەوە. لە پشـــت دەرگاکانی قەڵاکەوە کایان بڵاو کردەوە وئاژەڵەکان لە ســـەر نووکە پەنجە درۆشـــتن و بەچاوی فرمێســـکاوییەوە، لە یەکتریان دەپرســـی گەر ڕێبەرەکەیان کۆچی دوایی بکات، چ قوڕێک بە ســـەردا بکـــەن. وا بڵاو بووەوە کە ســـەرەڕای هەموو ئاگادارییەکان، سنۆباڵ ئاخری کاری خۆی کردووەو توانیویەتی خواردنەکەی ناپلیۆن ژەهراوی بکات.

دەمەو نیوەڕۆ دیسان سکوئیلەر هاتەوە کە هەواڵێکیتر بگەیەنێ. هاوڕێ ناپلیـــۆن وەک دوایین کاری ژیانی خۆی فەرمانی دەرکردووە کە ســـزای خواردنەوەی ئەلکول لەسێدارەدانە.

بەڵام کاتی شـــەو ناپلیۆن باشـــتر بوو. بەیانی ڕۆژی دواتر ســـکوئیلەر مزگێنی دا کە ڕوو لە باشـــییە و شەوی دواتر ناپلیۆن دەستی بەکار کرد و ڕۆژێـــک دواتر بوو کە ناپلیۆن ئەمری بە ویمپر کرد کە لە ویلنگدن چەند کتێب لە بابەت ئارەق دروســـت کردنی بۆ بکڕێ. حەفتەیەک دواتر ناپلیۆن ئەمـــری کرد کە ئەو پارچە زەوییەی پشـــت باخە میوەکـــە، کە بڕیار بوو لەوەڕگای ئاژەڵە لەکار کەوتووەکان بێ، بکێڵدرێتەوە.

ســـەرەتا گوتیان کە زەوییەکە کەم هێزە و دەبێ دیسان داچێندرێتەوە، بەڵام پاشان ڕوون بووەوە کە ناپلیۆن بڕیاری داوە جۆی تێدا بەرهەم بهێنن.

هـــەر لەم ڕۆژانەدا بوو کە ڕووداوێکی نامۆ قەوما کە کەس ســـەری لێ دەرنەهێنا. شەوێک لە دەور و بەری کاتژمێر دوازدەدا قرپەی شکانی شتێک

بیسترا و ئاژەڵەکان بە شێواوی لە تەویلەکە هاتنە دەر.

شەوێکی مانگەشەو بوو. لەبن دیواری تەویلە گەورەکەدا، لە ژێر ئەو دیوارەی کە حەوت فەرمانەکەی لە سەر نووسرابوونەوە، پەیژەیەکی شکاو لە سەر ئەرزەکە بوو. سکوئیلەر بە بێهۆشی لە پەنای پەیژە شکاوەکە کەوتبوو. لە پەنایدا چرا لەنتەرێک، فڵچەیەک و کاسەیەک پڕ لە ڕەنگی سپی کە هەمووی ڕژابوو دەبینرا. سەگەکان بە پەلە دەوریان گرت. کاتێک حاڵی هاتەوە سەرخۆ، بردیان.

هیچ کام لە ئاژەڵەکان سەریان لەم ڕووداوە دەر نەهێنا جگە لە بنجامینی پیر کە زیرەکانە لمبۆزی دەجووڵاند و وا دیار بوو کە شتێکی لێ حاڵی ببوو، بەڵام هیچی نەدرکاند. چەند ڕۆژ دواتر کە موریل لە بەر خۆیەوە حەوت فەرمانەکەی دەخوێندەوە، بۆی دەرکەوت کە دیسان یەکێک لە فەرمانەکان جۆرێک نووسراوە کە ئاژەڵەکان بە هەڵە لێی حاڵی ببوون. ئاژەڵەکان وایان دەزانی کە بڕگەی پێنجی فەرمانەکە دەڵێ کە هیچ ئاژەڵێک ئەلکول ناخواتەوە لە حاڵێکدا کە چەند وشەیان لە بیر کردبوو.

فەرمانی پێنجەم دەیگوت کە هیچ ئاژەڵێک بەڕێژەیەکی زۆر ئەلکول ناخواتەوە!

□

## وەرزی ٩

ســـمە قڵەشاوەکەی باکسر بۆ ماوەیەکی درێژ لە ژێر چاوەدێری و دەرماندا بوو. دروســـتکردنەوەی دووبارەی ئاشـــەکە لە ســـبەی ڕۆژی پاش جێژنی سەرکەوتنەکە، دەستی پێکردەوە. باکسر نەیدەویست تەنانەت یەک ڕۆژیش کارەکەی بوەســـتێنێ و نەشیدەهێشت کەس دەرک بە ئێش و ئازارەکەی بکات. بەڵام لە بێدەنگی شەوانەدا بە کلووری دەگوت کە سمەکەی زۆری ئازار ئەدات.

کلوور لە گژ و گیای جۆراوجۆر مەڵهەمی بۆ دروســـت دەکرد و لە سەر زامی ســـمەکەی دادەنا. لە گەڵ بنجامین دوو کەســـی زۆریان لە باکســـر دەکرد کە کەمتر ئیش بکات. کلوور دەیگوت سییەکانی ئەسب بۆ هەمیشە ســـەلامەت نابن. بەڵام باکسر گوێبیستی ئەم قسانە نەدەبوو و تەنیا هیوای ئەوە بوو کە پێش لەوەی پەککەوتە بێت کاری دروست کردنەوەی ئاشەکە کۆتایی پێ بێت.

لە پێشـــدا کاتێـــک یاســـاکانی قەڵای ئـــاژەڵان دیاریکـــران، تەمەنی

لەکارکەوتوویی ئەســـب و بەرازەکان دوازدە ســـاڵ، گاگەل چواردە، سەگ نۆ، مەڕ حەوت، مریشـــک و قاز پێنج ســـاڵ دیاریکرا و جیرەی تەواویش بـــۆ لەکارکەوتـــووەکان ڕەچـــاو کرا. لـــەم ماوەیەدا هیـــچ ئاژەڵێک لە کار نەگێڕدرایـــەوە، بەڵام لەم دواییانەدا زۆر لە ســـەر ئەم بابەتە قســـە دەکرا. ئێســـتا کە مەزرای پشـــت باخە میوەکە بۆ داچاندنی جۆ تەرخان کرابوو، دەیانگوت کە سووچێک لە لەوەڕگە گەورەکە بۆ شوێنی حەوانەوەی ئاژەڵە لەکارگێڕدراوەکان تەرخان دەکرێ و دەشیانگوت کە جیرەی هەر ئەسپێک ڕۆژی دوو کیلۆ جۆ و لە زستانیشدا شەش کیلۆ وێنجە لەگەڵ یەک گێزەر و ئەگەر بڕەخسێت یەک سێو لە ڕۆژەکانی پشوودا دەبێت.

دوازدەهەمین ســـاڵیادی لە دایک بوونی باکســـر، هـــاوکات بوو لەگەڵ ئاخری هاوینی ساڵی داهاتوو. لەم ماوەیەدا گوزەرانی ژیان قورس و ناخۆش بوو. زستان وەک ساڵی ڕابردوو سارد و خۆراکیش بڕێک کەمتر بوو. جیرەی ئاژەڵەکان جگە لە بەراز و ســـەگەکان، کەم کرابووەوە. سکوئیلەر دەیگوت ناکرێت هەموو ئاژەڵێک وەک یەک خۆراکی بەر بکەوێت.

هەر چەند وا دیاربوو کە خۆراک لە کەمیدایە، بەڵام بۆ سکوئیلەر کێشە نەبوو کە بە ئاژەڵەکانی بسەلمێنێ کە کەم و کورتی نییە، بەڵکوو بارودۆخەکە وایکردووە کە لە جیرەی ڕۆژانەدا، دەســـت پێوە بگیرێت. سکوئیلەر هەموو کات بەجێی کەم بوونەوە، دەیگوت دەست پێوە گرتن، بەڵام لە چاو کاتی جۆنزە، هەموو شـــتێک زۆرتر کرابوو. ســـکوئیلەر بە پەلە چەند ژمارەی بە دوای یەکدا دەخوێندنەوە بۆ ئەوەی بە ئاژەڵەکانی بســـەلمێنیت کە ئێستا لە چاو ئەو کاتە جۆ، شێلم و وێنجەی زیاتریان هەیە. کاتێکی کەمتر ئیش دەکرێ و ئاوی خواردنەوەشیان سارد و خاوێنترە.

تەمەنەکان درێژتر و پاک و خاوێنی منداڵەکان باشتر بووە. لە تەویلەدا

کای زیاتر هەیە و ئازاری مێشـــەکان کەمترە. ئاژەڵەکان بڕوایان بە هەموو ئەم شتانە دەکرد. لە ڕاستیشدا جۆنز کەم تا کورت لەبیر کرابوو. دەیانزانی کە ژیانی ئەمڕۆیان دژوارە، زۆربەی کات برسین، سەرمایان دەبێ و لە کاتی خەوەکاندا نەبێ، کار دەکەن، بەڵام بێ‌گومان ڕۆژانی ڕابردوو لە ئێســـتاش خراپتر بوو. بەم جۆرە بیر کردنەوانە دڵخۆش دەبوون. ســـەرەڕای ئەمانەش ئەو کاتانە دیل بوون و ئێســـتا ئازاد. هەر ئەم بابەتەش ئەوەی دەردەخست کە ژیانی ئەمڕۆیان لە چاو ڕابردوو سەد قات خۆشترە. شتێکی تریش هەبوو کە هیچ کات سکوئیلەر لە ئاماژە پێکردنی نەیدەبوارد. دەیگوت لەم ڕۆژانەدا دەمی زیاتر بۆ خواردن کراوەن.

لە پاییزدا چوار مالۆس دوا بە دوای یەک زان و ســـەرجەم سی و یەک بزەڵەیان بوون، هەمووشـــیان کەم تا کورت وەک یەک دەچوون و بە هۆی ئەوەشەوە کە ناپلیۆن تەنیا یەکانەی ناو مەزراکە بوو، ڕەگەزەکەیان دیار بوو.

بزەڵەکانیش لە چێشـــتخانەکە لە ژێر چاوەدێـــری ناپلیۆندا دەژیان. لە باخەکەدا وەرزشـــیان دەکرد و بۆ گاڵتە کردن لەگەڵ بێچووی ئاژەڵەکانیتر دابڕابوون. هەر لەم کاتانەدا بوو کە هەرکات ئاژەڵێک لە ســـەر ڕێ تووشی بەرازێک ببوایە، لە پەنایەکدا دەوەســـتا تا بەرازەکە دەڕۆیشت. هەروەها باو بوو کە بەرازەکان لە هەر پلەو پایەیەکدا، وەک جیاوازییەک هەموو ڕۆژانی یەکشـــەممە نەوارێکی سەوزیان لە کلک دەبەســـت. تا ڕادەیەک مەزراکە ســـاڵێکی پڕ لە ســـەرکەوتنی پاش خۆی نابوو، بەڵام ئێستاش هەر کەمی پارەیان هەبوو. دەبوایە بۆ قوتابخانە خشت و زیخ و گەچ بکڕدرایە. هەروەها دەبوایـــە بـــۆ کڕینی ئامێرەکانی ئاشـــەکە، نەوت، مۆم و شـــەکر و ... پارە پاشەکەوت بخرایە.

ناپلیـــۆن بەرازەکانی لە خواردنی قەند گێرابووەوە. ئاخر دەیگوت دەبێتە

هــۆی قەڵەو بوون. هەروەها دەبوایە زۆر پێداویســـتیتر وەک بزمار، دەزوو، خەڵووز، سیم، ئاسن و بیسکویت بۆ سەگەکان بکڕدرایە.

وێنجە و بەشــێک لە پەتاتەکان فرۆشــران و فرۆشــتنی هێلکەش تا شەشســـەد دانە لە حەفتەدا، زیاد کرا. بە جۆرێک کە لەو ساڵەدا جووچکە وەک سالانی پێشوو نەبوون و ڕادەی مریشکەکان وەک خۆی مایەوە.

جیرەکە لە مانگی دێســـەمبەردا کەم ببووەوە. لە مانگی فێوریەشدا کەم کرایەوە. هەڵکردنی چرا بە مەبەســـتی دەست پێوەگرتن قەدەغە کرا. بەڵام بەرازەکان بۆخۆیان لە ئاسایشـــدا بوون. لە ڕاستیشدا هەموو لە قەڵەوبووندا بـــوون. لە یەکێک لـــە دوانیوەڕۆکانی کۆتایی مانگی فێوریـــەدا ئاژەڵەکان بۆنێکـــی خۆشـــیان هاتە لووت کە نەیاندەزانی چییـــە. با بۆنەکەی لە لای کارگەی دروست کردنی ئاوجۆی پشت چێشتخانەکەوە دەهێنا.

ئەم شـــوێنە لە دوای جۆنزەوە چۆڵ کرابوو. یەکێک لە ئاژەڵەکان گوتی کە ئەمـــە بۆنی جۆی کولاوە. ئاژەڵەکان بە ئیشـــتیاوە بۆنەکەیان هەڵمژی و واشـــیان بیر کردەوە کە لەوانەیە بۆ شـــەو جۆی کولاویان هەبێ، بەڵام هەواڵێک لە جۆی کولاو و گەرم نەبوو. لە یەکشـــەممەی دواییدا ڕاگەیەنرا کـــە بەرهەمی جۆ، تایبەتە بە بەرازەکان. لە زەوی پشـــت باخە میوەکەش جۆ داچێندرابوو.

هـــەر زووش ئەم هەواڵە بڵاو بووەوە کە هـــەر بەرازێک ڕۆژانە نیو لیتر ئاوی جۆی هەیە و چوار لیتریش تایبەتە بە ناپلیۆن کە لە گۆزەی چینیدا بۆیان دەبرد.

ئەو سەختی و ئازارانەی کە ئاژەڵەکان دەیانچێشت لە شکۆی قەلاکەیان کەم دەکردەوە. لەم ڕۆژانەدا، ســـروود و گۆرانی و وتەبێژی و خۆپیشاندان زۆرتر ببوون. ناپلیۆن فەرمانی دەرکردبوو کە خۆپێشـــاندان بکرێ بۆ ئەوەی

سەرکەوتنەکان جێژن بگرن.

ئاژەڵـــەکان لە کاتی دیاریکراودا دەســـتیان لە کار دەکێشـــایەوە و لە شـــوێنێکی تایبەتدا وەک ســـەرباز ڕیز دەبوون و ڕێدەکەوتن. بەرازەکان لە پێشـــەوە و بە دوای ئەوانیشدا ئەسپەکان، گاگەلەکە، مەڕەکان و باڵندەکان ڕێپێوانیان دەکرد. ســـەگەکانیش لە هەر دوو لای ڕیزەکەوە درۆیشتن و لە پێش هەمووشـــیانەوە کەڵەشـــێرەکەی ناپلیۆن بوو. باکسر و کلوور ئەو ئاڵا ســـەوزەیان هەڵدەگرت کە لە ســـەری نەخشی ســـم و شاخێک کێشرابوو و دروشـــمی بژی هاوڕێ ناپلیۆنیش نووســـرابوو. لە دواییدا ئەو شـــێعر و هەڵبەستانەی بە ناپلیۆنیان هەڵدەگوت، دەخوێندرانەوە. ئەوکات سکوئیلەر لە مەڕ دوایین پێشکەوتنەکان و زیادبوونی بەروبووم کەمێک ئەدوا. هەروەها فیشـــەکێکیش دەتەقێندرا. مەڕەکان زۆریان حەز لە خۆپیشاندان بوو. هەر کاتیـــش پۆلێک لـــە ئاژەڵەکان کە لە نەبوونی بەرازەکان و ســـەگەکاندا لە سەر بابەتێک دەستیان دەکرد بە گلەیی کردن و نارەزایەتی دەربڕین، ئەوە مەڕەکان ئەوانیان بە بارەبارِ (چوارپێ باش دوو پێ خراپ) بێدەنگ دەکرد. بە شـــێوەیەکی گشـــتی ئاژەڵەکان لەم جۆرە جێژنانە چێژیان وەردەگرت و ئەوەیـــان بیـــر دەهاتەوە کە خاوەن و ئەربابی خۆیانن و ئیشـــێکیش کە دەیکەن بەس بۆ خۆیانە و ئەمەش دەبووە هۆی حەسانەوەیان.

بە هەر شێوەیەک بێ، بە گۆرانی و خۆپیشاندان و وتەبێژی سکوئیلەر و تەقاندنی گوللە و قووڕەقووڕی کەڵەشێرەکە و هەڵدانی ئاڵاکە بۆ ماوەیەکی کورت لە بیر خۆیان دەبردەوە کە سکیان خاڵیە و برسیانە.

لە مانگی ئاوریلدا لە قەڵای ئاژەڵان، کۆمارییەت ڕاگەیەنرا و پێویســـتی کرد کە ســـەرکۆمارێک هەڵبژێردرێ. لە ناپلیۆن زیاتـــر پاڵێوراوێک نەبوو، هەر بۆیەش ئەو بە زۆرینەی دەنگەوە بوو بە ســـەرۆکی ئەو کۆمارە. هەر لە

ڕۆژی هەڵبژاردنەکەدا بوو کە قسە و باسێکی تازە لە ناو ئاژەڵەکاندا سەری هەڵدا. ئەویش ئەمە بوو کە گۆیا بەڵگەی تازە دۆزراونەتەوە کە دەسەلمێنن سنۆباڵ سەرەڕای ئەوەی کە دەیهەویست شەڕی گادانەکە شکست پێبێنێ، لە ڕاستیدا ئەو لەو شەڕەدا وەک سەرکردەیەکی هێزی مرۆڤەکان بە دروشمی «بژی مرۆڤایەتی» هاتۆتە ناو شەڕەکەوە و ئەو برینەی کە ئێستاش کەسانێک لە یادیان ماوە، جێی زامی ددانەکانی ناپلیۆن بووە.

لە ناوەڕاست مانگی هاویندا، موزز، قەلەڕەشە ماڵیەکە، دوای چەند ساڵان دیسان گەڕایەوە بۆ قەڵاکە. هیچ گۆڕانێکی بە سەردا نەهاتبوو. دیسانەوە نەکرکار بوو و ئێستاش باسی لە وڵاتی شیر و هەنگوین دەکرد. لە سەر کۆتە دارێک هەڵدەنیشت و باڵە ڕەشەکانی لە یەک دەدان و هەر کەسیش کە مەجالی پێدەدا ئەوە سەری قسەی لەگەڵ دەکردەوە. بە دەندووکە درێژەکەی ئیشارەتی بە ئاسمان دەکرد و بە تام و چێژەوە دەیگوت: «هاوڕێیان لەو سەرەوە، ڕێک لە پشت ئەو هەورانەوە، وڵاتی شیر و هەنگوینە. ئەو وڵاتەی کە ئێمەی ئاژەڵی ماندوو و نەحەساوە تێیدا بۆ هەمیشە لە ماندوویی کار ڕزگارمان دەبێ». هەروەها دەیگوت کە لە یەکێک لە فڕینە دوور و درێژەکانی، چاوی بەو شوێنە کەوتووە. مەزرای نەبڕاوەی شەوەر و پەرژینی زێڕین کە قەند و کولیچەی لێدەڕوێن، بەر چاو کەوتوون. زۆرێک لە ئاژەڵەکان بڕوایان بە وتەکانیان دەکرد. بیر و بۆچوونیشیان وابوو کە ژیان ئێستا بۆ ئەوان پڕە لە ئازار و ناخۆشی. لە ڕاستیشدا دەبێ جیهانێکی باشتر و شوێنێکی خۆشتر هەبێ.

شتێک کە تێگەیشتنی دژوار بوو، ڕەوشتی بەرازەکان لە بەرابەر موززدا بوو. وتەکانی ئەویان لە مەڕ وڵاتی شیر و هەنگوین بە شێوەیەکی سووکایەتی پێکردن، بە درۆ دەزانی بەڵام سەرەڕای ئەمانەش ئیزنیان دابوو

کــە بێ ئەوەی ئیش بکات لە مەزراکەدا بمێنێتەوە و تەنانەت ڕۆژانە یەک بنکە پیاڵەیان ئاوجۆ بۆ ڕەچاو کردبوو.

باکسر دوای ئەوەی زامی ســمەکەی سارێژ بوو، زیاتر لە پێشوو کاری دەکرد. لە ڕاستیدا ئەو ساڵە هەموو ئاژەڵەکان بە خۆڕاگرییەوە کاریان کرد.

بێجگە لە کاری مەزراکە و دروســت کردنەوەی بینای ئاشــەکە، کاری دروست کردنی قوتابخانەی بزەڵە بەرازەکانیش لە سەرەتای مانگی مارسدا دەستی پێکردبوو. زۆر کات ئیش کردنی چەند کاتژمێری بە خواردنی کەمەوە لە تاقەت بە دەر بوو. بەڵام باکســر لــە کارکردنی خۆیدا هیچ کات کەمی نەدەهێنا. لەوەی کە دەیگوت یان دەیکرد، نیشــانەیەک لە کەم بوونەوەی هێزەکەی نەدەبینرا. بەس لە ڕواڵەتدا تۆزێک تێکشکابوو. پێستەکەی وەک جاران نەئەدرەوشــایەوە و کەفەڵەکانیشی چرچ و لۆچ ببوون. دەیانگوت کە بە شــینکەی بەهار باش دەبێت. بەهار هات و باکســر قەڵەو نەبووەوە. زۆر جاران لە شــوێنی هەورازدا هەموو هێزی خۆی کــۆ دەکردەوە بۆ ئەوەی قورســاییەک ڕابکێشێ، بەڵام وا دیار بوو ئەو شتەی کە ئەوی لە سەر پێ ڕاگرتــووە، بەس بیــر و باوەڕییەتی. لەم جۆرە کاتانەدا لێوەکانی شــێوەی «مــن زیاتر ئیش دەکەم»ی بە خۆوە دەگرت. چیدی دەنگی دەر نەدەهات. کلوور و بنجامین دیســانەوە وەبیریان دەهێنایەوە کە ئاگاداری لەشساخی خۆی بێت و دیســانەوەش باکسر گوێی پێنەئەدان. دوازدەهەمین ساڵڕۆژی لــە دایکبوونی نزیک دەبووەوە. هیچ شــتێک بەلایەوە گرنگ نەبوو. تەنیا ئەوە نەبێ کە بە تەما بوو پێش لە کارگێڕانەوەی، بەردی تەواو بۆ دروست کردنەوەی ئاشەکە کۆ بکاتەوە.

شــەوێکی درەنگ وەخت لە وەرزی هاویندا، هەواڵێک هات کە باکسر کارەساتێکی بۆ پێشهاتووە. باکسر شەو بە تەنیا بۆ ڕاکێشانی بارێکی قورس

بۆ لای ئاشەکە چووەتە دەر. ئەو کات سەلامەت بوو بەلاّم دوو کۆتر بە پەلە هەواڵیان هێنا کە باکسر لە سەر تەنیشت کەوتووە و ناتوانێ هەڵبستێتەوە. نیوەی زیاتری ئاژەڵەکان بەرەو لای ئاشـەکە ڕێکەوتن. باکسـر لە سـەر ئەرزەکـە کەوتبوو. بە جۆرێک ملی لە بەینـی ماڵبێنی گارییەکەدا گیری کردبوو کە تەنانەت نەیدەتوانی سەریشـی بەرز بکاتەوە. چاوی نووقاندبوو و هەموو لەشـی شـەلاّلّی ئارەقە ببوو. خوێنی لـە دەم دەهات. کلوور لە تەنیشـتیەوە چۆکی دادا و پرسی: «باکسـر تۆ باشی؟» باکسر بە دەنگێکی کزەوە وەلاّمی دایەوە: «سـییەکانم ئازارم دەدەن. بەلاّم گرنگ نییە. وا بزانم کاری ئاشەکە بێ منیش تەواو دەبێ. بە ڕادەی پێویست بەرد کۆ بووەتەوە. خۆ منیش هەتا یەک مانگیتر ئیشم دەکرد. گەر ڕاستیشت بوێ زۆر لە مێژ بوو بیرم لە کارگێڕانەوەم دەکردەوە. واشم لێکدابووەوە کە بنجامینیش پیر بووە و لـە کار دەگێڕدرێتەوە و بۆ تەنیاییم هاودەنگم دەبێ». کلوور گوتی: «دەبێ زوو فریای کەوین. یەکێک بە پەلە بڕوات و سکوئیلەر خەبەر بکات». بـۆ خەبەردار کردنی سـکوئیلەر هەموو بە هەلاّدان ڕۆشـتن. تەنیا کلوور مایەوە و بنجامین کە لە تەنیشـت باکسرەوە دانیشت و بێ ئەوەی شتێک بڵێت بە کلکە درێژەکەی مێشەکانی لە باکسر دوور دەخستنەوە.

دوای چارەکە وەختێک سـکوئیلەر بە شڵەژاوی هات و گوتی: «هاوڕێ ناپلیۆن لەو ڕووداوە ناخۆشـەی کە بۆ یەکێک لە دڵسۆزترین خزمەتکارانی قەلاّکە پێش هاتووە، بە داخ و کەسـەرێکی زۆری دەزانێ و خەریکی ڕێ شێلانە بۆ ئەوەی بینێرێ بۆ نەخۆشخانەی ولینگتن». ئەم هەواڵە تا ڕادەیەک بوو بە هۆی شـڵەژانی ئاژەڵەکان. بێجگە لە مالی و سـنۆباڵ هیچ کام لە ئاژەڵەکان تـا ئەو کاتە قەلاّکەیان جێنەهێشـتبوو. هەروەها ئاژەڵەکانیش نەیاندەویست کە هاوڕێ نەخۆشەکەیان بچێتە ژێر چاودێری مرۆڤەکانەوە.

بەڵام سـکوئیلەر دەیگوت کە پزشکی ئاژەڵەکان باشتر دەتوانێ چارەسەری نەخۆشی باکسر بکات، هەر بۆیەش ئاژەڵەکان ڕازی بوون. دوای نیو کاتژمێر باکسر تا ڕادەیەک باشتر بوو. بە لارەلار و گێرەگێڕ بەرەو تەویلەکە ڕۆیشت. کلوور و بنجامین شوێنێکیان بە گیای وشک بۆ خۆش کردبوو.

باکسـر دوو ڕۆژ لە تەویلەکە مایەوە. بەرازەکان شووشەیەکی گەورەی پڕ لە دەرمانێکی ڕەنگ سـووریان لە سـندوقە دەرمانەکـەی ناو ژووری خۆشووشـتنەکە دیبووەوە کە بۆ باکسریان نارد. کلوور ڕۆژی دوو جارێ لە دەرمانەکەی دەدا بە باکسر و شەوانەش لە لای دەمایەوە و قسەی لەگەڵ دەکرد و بنجامینیش مێشەکانی لێ دەردەکرد.

باکسـر پێی دەگوتن لەو شتەی کە بە سـەری هاتووە نیگەران نییە. ئەگەر باش وەبێ دەتوانێ هیواداربێ کە سـێ ساڵیتر تەمەن بکات و هەر لـە ئێستاشـەوە بیر لەو کاتە پڕ لە حەسـانەوە دەکا کە لە گۆشـەیەکی لەوەڕگەکەدا دەیباتە سـەر. ئەمە بۆ یەکەم جار بوو کە باکسر مەجالی بیر کردنەوەی بۆ ڕەخسـابوو. دەیگوت بڕیـارم داوە لەو ماوەیەی کە ماویەتی ئەو بیست ودوو پیتەی تر فێر ببم.

بنجامین و کلوور تەنیا دوای ئیش دەیانتوانی لە لای باکسـر بمێننەوە. لە نیوەڕۆژدا بوو کە بارکێشـەکە بۆ بردنی باکسـر هات. لەو کاتەدا هەموو ئاژەڵەکان لە ژێر چاودێری بەرازێکدا خەریکی بژار کردنی ناو شـێلمەکان بوون. هەموو بە بینینی بنجامین کە بە چوار ناڵ و زەڕەزەڕ لە لای قەڵاکەوە دەهات، واقیان وڕما. ئەمە یەکەم جار بوو کە بنجامین بەو شێوەیە دەبینرا و بە دڵنیاییەوە یەکەم جاریش بوو کە ئەویان لە کاتی چوار ناڵ ڕۆیشـتن دەبینی. هـاواری کرد، پەلە کەن! خەریکن باکسـر دەبەن! ئاژەڵەکان بێ ئەوەی چاوەڕێی ئیزن دانی بەرازەکە بن، دەسـتیان لە کار کێشایەوە و بە

پەلە بەرەو خانووەکە هەڵاتن. لەوێ، لە حەوشـــەی تەویلەکەدا بارکێشێکی گەورەی دوو ئەســـپە، کە بە دەوروبەریەوە نووسراوەی پێوە بوو، ڕاگیرابوو. پیاوێکی ڕواڵەت شەیتانیش کە کڵاوێکی ڕەنگاوڕەنگی کورتی لە سەردا بوو، لە جێی لێخوڕەکەی دانیشتبوو. جێی باکسریش لە تەویلەکەدا چۆڵ بوو.

ئاژەڵەکان لە دەوری بارکێشەکە خڕ بوونەوە و بە پۆل دەیانگوت: «خودا ئاگادارت بێ باکسر!».

بنجامین لە کاتێکدا کە سمکۆڵی دەکرد و جووتەی دەهاویشتن، هاواری کرد: «ئەی گەمژانە! نابینن لە دەوری بارکێشەکە چی نووسراوە؟»

ئـــەم ئاکارەی بنجامین، بـــوو بە هۆی ئەوە کە ئاژەڵـــەکان بکەونە بیر کردنـــەوە. بێدەنگی هەموویانی داگرت. موریل پچڕ پچڕ دەســـتی کرد بە خوێندنەوەی وشەکان بەڵام بنجامین ئەوی لاناو بەمجۆرە خوێندییەوە :

«ئاڵفرد سیمۆندز، گا کوژ و دەباخی شاری ولینگدون، فرۆشیاری پێست و کوود و ئێسکی ئاژەڵ، دروســـتکەری کولانەی سەگ. ئێوە نازانن مانای چییە؟ خەریکن باکسر دەبەن بۆ کوشتارگا!».

هاوارێـــک لـــە نیگەرانیەوە لـــە قوڕگی ئاژەڵەکان هاتـــەدەر و هەر لەم کاتەدا ئەو پیاوەی کە لە جێی لێخوڕەکە دانیشـــتبوو بە قەمچییەکەی لە ئەسپەکانی دا و بارکێشەکە بە پەلە دوور کەوتەوە. کلوور هەوڵیدا بە چوار ناڵ بڕوا، بەڵام دوا کەوت و هاواری کرد: «باکســـرا وەرە دەر، زووکە، وەرە دەر! گەرەکیانە بتکوژن».

هەموو ئاژەڵەکان دووپاتیان کردەوە، «وەرە دەر باکســـر وەرە دەر!» بەڵام بارکێشـــەکە دوور کەوتبووەوە و ڕوون نەبوو کە باکســـر وتەکەی کلووری گـــوێ لێبووبێ. دوای ماوەیەک دەم و چاوی باکســـر لە بەر پەنجەرەکەدا نەماو دەنگی سمکۆڵەکانی لە ناو بارکێشەکەدا دەهاتە دەر. هەوڵی دەدا بە

لەقە ڕێگایەک بۆ چوونە دەرەوە وەدۆزێ.

لە ڕابردوودا چەند لەقەی باکسر بارکێشەکەی وەک قووتوی شەمچەیەک ورد دەکرد، بەڵام بە داخەوە کە ئەو هێز و تاقەتەی نەمابوو! دوای ماوەیەک چیتر دەنگی سمکۆڵ کردنی باکسر نەبیسترا. ئاژەڵەکان لەوپەڕی هیوا بڕاویدا بە ئەسپەکانی بارکێشەکەیان دەگوت: «هاوڕێیان! براکەی خۆتان بەرەو مردن مەبەن!».

بەڵام ئەوان نەزانتر لەوەی بوون کە لە ڕاستی ڕووداوەکە تێبگەن. بەس گوێچکەکانیان قوت کردبووەوە و خێراتر دەڕۆیشتن. ئیتر باکسر نەدەبینرا. ئاژەڵەکانیش درەنگ بیریان لەوە کردەوە کە دەرگا پێنج پاشکۆڵییەکە دابخەن. بارکێشەکە لە دەرگاکەوە گوزەرا و لە بەر چاو ون بوو. باکسر بۆ جارێکیتر نەبینرایەوە.

پاش سێ ڕۆژ ڕاگەیەنرا کە سەرەڕای هەوڵی زۆر بۆ چارەسەر کردنی باکسر بە داخەوە لە نەخۆشخانەی ولینگدون مردووە!

سکوئیلەر هەواڵەکەی ڕاگەیاند و گوتی خۆم لە دوایین ساتەکانی ژیانیدا لە لای بووم. سکوئیلەر چمکی بەرز کردەوە و چاوەکانی سڕی و گوتی: «دڵتەزێنترین دیمەن بوو کە لە ماوەی ژیانمدا بینیومە. من تا هەناسەی ئاخر بە سەریەوە بووم. باکسر لە دوایین کاتەکانی ژیانی، بە دەنگێکی کز کە بە دژواری دەبیسترا، بە گوێمدا چرپاندی و گوتی کە تەنیا پەژارەم ئەمەیە کە پێش تەواو بوونی ئاشەکە دەمرم». هەروەها سکوئیلەر گوتی: «دوایین قسەکانی ئەمانە بوون: هاوڕێیان بۆ پێشەوە، بە ناوی ڕاپەڕین بۆ پێشەوە، هەر بژی یاسای ئاژەڵان، هەر بژی هاوڕێ ناپلیۆن و ناپلیۆن ڕاستە».

لێرەدا لە کتوپڕ هەڵس‌وکەوتی سکوئیلەر گۆڕا. دوای ماوەیەک درەنگ

کــردن و پێــش ئەوە درێژە بە قســەکانی بدات بە چــاوە وردەکانی و بە شــێوەیەکی دردۆنگانــە و بە پەلە ســەیری دەور و بەری کــرد و گوتی: «ڕاپۆرتیان داوە کە کاتی ڕۆیشــتنی باکسر پڕوپاگەندەی گەمژانە لە ئارادا بووە. گۆیا بە بینینی بارکێشــەکەی ســیمۆندزی گاکــوژ، وایان زانیوە کە باکســر دەبردرێ بۆ کوشــتارگا. باوەڕ ناکرێ کــە ئاژەڵێک تا ئەم ڕادە بێ عەقڵ بێ».ســووڕێکی بە کلکی دا و یەک دوو جــاران ئەم بەر ئەو بەری کــرد و بــە ڕق و تووڕەییەوە هاواری کرد: «هاوڕێیان ئێوە دەبێ تا ئێســتا ڕێبەرەکەی خۆتان ناسیبێت. ڕوون کردنەوەی ئەم شتە ئاسانە. ئەو کابرایە بارکێشــێکی کڕیوە کە پێشتر ئی قەسابێک بووە و ئێستاش نووسراوەکانی پاک نەکردۆتەوە و هەر ئەمەش بۆتە هۆی ئەوە کە داڵغە دروست بکات بۆ پۆلێک ئاژەڵی گەوج».

ئاژەڵەکان بە بیستنی ئەم هەواڵە دڵنیا بوون و کاتێکیش کە سکوئیلەر بە وردی باســی چاودێــری و ئەو دەرمانە گــران بەهایانەی بۆ کردن کە ناپلیۆن بێ دواکەوتن لە کیســەی جوامێری خۆی کڕیبوونی، ئاژەڵەکان بە تەواوی ئاســوودە بوون و هیچ دوودڵیان نەما. ئــەو پەژارەش کە بە هۆی مردنی هاوڕێکەیان لە دڵیان خزابوو، بەو باوەڕەی کە هاوڕێکەیان لە دوایین ساتەکانی ژیانیدا دڵخۆش بووە، کەم بووەوە.

ناپلیۆن لە کۆبوونەوەی یەکشــەممەی دواییدا، بەشداری کرد و بۆ ڕێز گرتن لە باکسر چەند وتەی ئاراستە کرد و گوتی کە گێڕانەوەی لاشەکەی باکسر گوونجاو نەبوو بەڵام ئەمری کردووە تاجەگوڵینەیەک لە درەختەکانی باخەکە دروست بکەن و لە سەر گۆڕەکەی باکسر دایبنێن. هەروەها گوتی کە بەرازەکان دەیانهــەوێ دوای چەند ڕۆژ میوانییەک بۆ بیرەوەری و ڕێز لێنانی باکسر پێک بێنن. ناپلیۆن وتەکانی بە بیر هێنانەوەی دوو دروشمی

ســـەرەکی باکســـر دوایی هێنا «مـــن زیاتر ئیش دەکـــەم» و «هەموو کات وتەکانی ناپلیۆن ڕاســـتن» گوتیشـــی کە جێی خۆیەتی ئەم دوو دروشمە ببێتە ئاوێزەی گوێی هەموو ئاژەڵێک. ڕۆژی میوانییەکە ماشینە باربەرەکەی دووکانەکەی وینگدون هات بـــۆ مەزراکە و چەکمەزەیەکی گەورەی دا بە بەرازەکان.

ئەو شـــەوە لە خانـــوو بەرەکە دەنگی گۆرانی دەهـــات و لە دواییش دا دەنگی زرینگە و شریخەی شکانی شیشە و پیاڵە بیسترا. تا نیوەڕۆی ڕۆژی دوای ئەو شـــەوە لە قەڵاکەدا هات و چـــۆ نەبوو. بڵاو بووەوە کە بەرازەکان لە شـــوێنێکی نەزانراوەوە پارەیان بۆ کڕینی چەکمەزەیەکی تر ویســـکی، بەدەست هێناوە!

□

## وەرزی ١٠

چەند ســـاڵ ڕابرد. وەرزەکان یەک بە دوای یەکدا دەهاتن و دەڕۆیشـــتن. تەمەنی کورتی ئاژەڵەکان بەسەر دەچوو. سات و وەختێک هات کە بێجگە لـــە کلوور و بنجامین و موزز و چەند بـــەرازی تر ئاژەڵێک نەبوو کە پێش ڕاپەڕینەکـــەی لە بیر بێـــت. موریل نەمابوو. بلوبڵ و جســـی و پینچڕیش هەروەها. جۆنزیش لە یەکێک لە خەســـتەخانەکانی نەخۆشە ئەلکولییەکان گیانی لەدەست دابوو. باکسریش لە لای چەند کەسی دەگمەن نەبێ، هەر لە بیر نەمابوو. کلوور ببوو بە ماینەکی پیر کە بازووڵەکانی بێ هێز ببوون و چاوەکانی خەریک بوو ئاویان دەهێنا. دوو ساڵ لە تەمەنی لە ِکار گێڕانەوەی گووزەرابوو، بەڵام لە ڕاستیدا تا ئەم کاتە هیچ ئاژەڵێک لەکار نەگێڕدرابووەوە. زۆر لە مێژ بوو باســـێک لەو زەوییە نەدەکرا کە بڕیار بوو تەرخانی کەن بە ئاژەڵـــە لە کار گێڕدراوەکان. ناپلیۆن ئێســـتا بەرازێکی یەکانەی پیر بوو بە کێشی سەد و بیســـت وپێنج کیلۆوە. سکوئیلەر بەڕادەیەک قەڵەو ببوو کە بە زەحمـــەت چاوەکانی بۆ هەڵدەهات. بەڵام بنجامین چۆن بیندرابوو هەر

وا مابـــووەوە. جگـــە لەوەی دەور و بەری لمبۆزی بـــۆز ببوو، گۆڕانێکی وای تێدا بەدی نەدەکرا و دوای مردنی باکســـریش مڕ و مۆچتر ببوو. کەمتر لە جارانیش دەدوا. هەر چەندە بەو جۆرەی کە لە ســـەرەتاوە چاوەڕوان دەکرا نەبـــوو، بەڵام تـــا ڕادەیەک ئاژەڵی مەزراکە زیادیـــان کردبوو. ئاژەڵانێک لە دایک ببوون کە ڕاپەڕین بە لایانەوە وەک ئەفسانەیەکی دوور وابوو کە دەم بە دەم پێیان گەیشـــتبوو. هەروەها ئاژەڵیتـــر کڕدرابوون کە پێش هاتنیان هیچ کات ئەم شـــێوە چیرۆکەیان نەبیستبوو. ئێستا مەزراکە جگە لە کلوور سێ ئەسپی دیکەی هەبوو. ئەسپەکان باش و بەرچاو بوون. بە باشی کاریان دەکرد و هاوڕێی باش بوون، بەڵام گەمژە بوون. هیچ کامیان لە فێر بوونی پیتەکان، لە پیتی «ب» ســـەر نەکەوتن. هەر شتێک کە لە بارەی ڕاپەڕین و بنەما ئاژەڵییەکانەوە بۆیان باس دەکرا، وەریان دەگرت. بە تایبەت کە لە لایەن کلوورەوە بوایە. وەک دایکێک ڕێزیان لە کلوور دەگرت، بەڵام پێتان وانەبێ شتێکی ئەوتۆیان لێ حاڵی ببوایە.

بار و دۆخی مەزراکە ڕێکتر و باشـــتر لە پێشوو بوو. تەنانەت بە کڕینی دوو پارچە زەوی لە ئاغای پیل کینگتن، بەربڵاوتریش ببوو. ئاشەکە دواجار بە سەرکەوتووانە دروســـت کرابوو و مەزراکە ئامێری گێرە کردن و وێنجە دروونی هەبوو. خانووبەرەی تازەی لێ ســـاز کرابـــوو. ویمپر ببووە خاوەنی گارییەکی یەک ئەســـپە. هیچ کات لە ئاشـــەکە بۆ دروست کردنی وزەی کارەبـــا بەهرە وەرنەگیرا. بەس بۆ هاڕینی دانەوێڵـــە کەڵکی لێ وەردەگیرا کە بەهرەیەکی باشـــی هەبوو. ئاژەڵەکان بە دڵگەرمیەوە خەریکی دروست کردنی ئاشـــێکیتر بوون تا پاش تەواو بوونی، ئامێری دروست کردنی وزەی کارەبای تێدا بەکار بهێنن. باســـێک لەو ژیانە خەیاڵاوییەی کە کاتی خۆی سنۆباڵ مێشـــکی ئاژەڵەکانی پێ پڕ کردبوو، نەبوو. تەویلەی ڕووناک، ئاوی

ســارد و گەرم لە تەویلەکاندا، ســێ ڕۆژ کار کردن لە حەفتەدا، هیچ کام باســیان لێ نەدەکرا. ناپلیۆن گوتبووی ئەم شتانە دژی بنەمای ئاژەڵگەرین و کامەرانی لە کاری زۆر و ژیانی ســاکاردایە. مەزراکە دەوڵەمەند ببوو، بێ ئــەوەی ئاژەڵەکان، بێجگە لە بەراز و ســەگەکان، دەوڵەمەندیان پێوە دیار بــێ. بۆی هەیە ئەم بار و دۆخەش بە هۆی ئەوەوە بێ کە ڕادەی ســەگ و بــەرازەکان زۆر ببوون. هەڵبەت وانەبوو کە ئــەوان کار نەکەن بەڵام بە پێی توانا و یاســای خۆیان ئیشــیان دەکرد. هەر بەو جۆرە کە سکوئیلەر مەسەلەکانی شی دەکردەوە و هیچ کاتیش ماندوو نەدەبوو، ئیدارە کردن و چاودێری مەزراکە پێویســتی بە کاری زۆر نەدەکرد. جۆری کارەکەی وابوو کە ئەو ئاژەڵانەی نەزانتر بوون، لە تێگەیشتنی بێ توانا بوون. سکوئیلەر بە ئاژەڵەکانی دەگوت کە بەرازەکان دەبێ هەموو ڕۆژێک بۆ پۆلێ کاری مێشک ماندووکــەر، کە بە «بەڵگە»، «ڕاپۆرت»، «پێش نــووس» و «بەیاننامە» ناوی لێدەبردن، خۆ هیلاک بکەن. بەو مانایە کە هەموو ڕۆژێک لاپەڕەی گەورەی پەرتووکیان بە وردی لە نووســراوە پڕ دەکرد و لە پاشــاندا دەیانسووتاند. سکوئیلەر دەیگوت ئەم کارە بۆ پێش بردنی کار و باری مەزراکە، بایەخدار و پێویستە.

بەڵام لە ڕاســتیدا لە ئیشــی بەراز و سەگەکان کە ڕادەشیان زۆر بوو و هەموو کاتیش ئیشتیای خواردنیان هەبوو، خۆراک بەرهەم نەدەهات. ژیانی ئاژەڵەکانیتر هەر وەک پێشــتر وابوو و هیچ گۆڕانێکی بە ســەردا نەهاتبوو. زۆربەی کات برسی بوون. لە سەر لەوێچێ کا دەنوستن. لە ئەستێڵەئاوەکە دەیانخواردەوە. لە مەزراکە کاریان دەکرد. لە زســتاندا بە هۆی سەرما و لە هاویندا بە هۆی مێشــەوە لە ڕەنج و ناخۆشــیدا بوون. ئەوانەی کە پیرتر بــوون جار و بــار هەوڵیان دەدا بە بیری بێننەوە کــە لە یەکەم ڕۆژەکانی

ڕاپەڕینەکەدا، ئەو کاتەی کە تازە جۆنز لە مەزراکە دەرکرابوو، بار و دۆخەکە لە ئەمڕۆ باشـــتر بوو یان نا. بەڵام شتێکیان بیر نەدەهاتەوە و پێوەرێکی وا نەبوو کە ژیانی ئێســـتایان لەگەڵ کۆندا هەڵســـەنگێنن. بەس ڕاپۆڕتەکانی ســـکوئیلەر بوون کە بە شـــێوەیەکی نەگۆڕدراو نیشانی دەدا هەموو شتێک بەرەو باشی دەڕوا. مەسەلەکە بۆ ئاژەڵەکان وەک گرێ پووچکەیەک وابوو کە کردنەوەکەی دژوار بوو. لە لایەکیتریشەوە ئاژەڵەکان کاتی بیر کردنەوەیان نەبوو. تەنیا بنجامین بوو کە دەیگوت هەموو کون و قوژبنی تەمەنی درێژی خۆی لە بیرە و دەزانێت کە هەموو شتێک هەر ئەوەیە کە پێشتر بووە و لە داهاتووشدا هەروا دەبێ. ژیان نە خراپتر دەبێ و نە باشتر. هەروەها دەیگوت کە برسیەتی و ماندوویی و ژێر چەپۆکی یاسای نەگۆڕدراوی ژیانن.

سەرەڕای هەموو ئەم شتانە هیچ کات ئاژەڵەکان دڵسارد نەبوون. تەنانەت بۆ ساتێکیش خۆشی و مەزنی ئەوەیان لەبیر نەکرد کە یەکێک لە ئەندامانی کۆمەڵەی قەڵای ئاژەڵانن. لە هەموو ئینگلیزدا مەزراکەیان تەنیا مەزرایەک بوو کە ئی ئاژەڵان بوو و هەر ئەوانیش بەڕێوەیان دەبرد.

هەمـــوو ئاژەڵـــەکان و تـــازە هاتووەکانیش کە لە چەند فەرســـەخیەوە هاوردەی ئەوێ کرابوون، بە چاوێکی تێکەڵ بە ئافەرینەوە دەیانڕوانییە ئەم بابەتە. ئەو کاتەی دەنگی تەقینی تۆپەکەیان دەبیســـت و ئاڵا سەوزەکەیان بە شەکاوەیی دەبینی، ناخیان پڕ دەبوو لە خۆشی و سەری قسە دەکرایەوە و بـــاس لـــەو ڕۆژە پیرۆزانە دەکـــرا کە جۆنز دەرکرا و حـــەوت فەرمانەکە ڕاگەیەندرا و باسی ئەو شەڕانەش کە مرۆڤە شەڕ ئەنگێزەکان تێیدا شکست دەدران، وەک چیرۆکێکـــی پاڵەوانی دەگێڕدرانەوە. ئێســـتاش خەویان بەو ڕۆژانەوە دەدی و باوەڕیشـــیان بە وتەکانی مێجر هـــەر مابوو کە دەیگوت مرۆڤەکان ڕاو دەنرێن و کۆماری مەزرا سەرسەوزەکانی ئینگلیز دادەمەزرێ.

دەیانگوت ڕۆژێک ئەوە ڕوو دەدات، بەڵام لە وانەیە ئەو ڕۆژە لە داهاتوویەکی نزیکــدا بێ. یاوەکوو لە ماوەی تەمەنی هیچ کام لە ئەواندا نەبێ. بەڵام ئەو ڕۆژە هەر دێت. ئێســتاش ئاهەنگی ســروودی ئاژەڵانی ئینگلیز بە دزییەوە دەخوێندرایــەوە. گەرچی نەیاندەوێرا بە بــەرزی بیخوێننەوە، بەڵام هەموو ئاژەڵەکان ئەو ســروودەیان دەزانی. ڕاســتە کە ژیانیــان دژوار بوو، هەموو ئاواتەکانیــان بەدی نەهاتبوو. ئەشــیانزانی کە وەکــوو ئاژەڵانیتر نین. گەر برسین، بە هۆی بوونی مرۆڤەکانەوە نییە. گەر زۆر کار دەکەن بۆ خۆیانە و هیچ بوونەوەرێک لە ناویاندا نییە کە لەســەر دوو پێ بڕوا. کەس بە ئەرباب بانگ ناکەن و هەموو چوار پێیەکان یەکسانن.

ڕۆژێکی ســەرەتای هاوین، سکوئیلەر فەرمانی دا کە مەڕەکان لە تەکیا بچن بۆ زەوییە بەر بڵاوەکان کە دوور لە مەزراکە بوو و بە نەمام داپۆشرابوو.

مەڕەکان لە ژێر چاوەدێری سکوئیلەردا ئەو ڕۆژە بە لەوەڕین ڕایانبوارد.

سکوئیلەر شەو بە هۆی گەرم بوونی ئەو شوێنە گەڕایەوە بۆ مەزراکە و بە مەڕەکانیشی گوتبوو کە لەو شوێنە بمێننەوە. مەڕەکان یەک حەوتەی تەواو مانەوە و لەو ماوەیەدا ئاژەڵەکانیتر هەواڵێکیان لە مەڕەکان نەبوو. سکوئیلەر زۆربەی کات لەگەڵ ئەوان بوو و دەشیگوت کە خەریکە سروودێکی تازەیان فێر دەکا و پێویستە ئەم ئەرکە لە شوێنی چۆڵ و بێدەنگدا بەجێ بهێنێ.

شــەوێکی خۆش بوو. مەڕەکان تازە گەڕابوونــەوە و ئاژەڵەکانیش تازە دەستیان لە کار کێشابووەوە کە دەنگی حیلکەی ئەسپێک لە حەوشەکەدا بیســترا. ئاژەڵەکان بە ترسەوە لە جێی خۆیاندا وەستان. ئەو دەنگە دەنگی کلوور بوو. کلوور دیســان حیلکاندی، هەر بۆیە ئاژەڵەکان تێکڕا بە چوارناڵ هێرشــیان بردە ناو حەوشەکە. ئەوەی کە کلوور دیبووی، ئەوانیش بینیان. بەرازێــک خەریــک بوو لە ســەر دوو قاچی دواوەی دەڕۆیــی. بەڵێ ئەوە

ســـكوئیلەر بوو. وەک ئەوەی وابوو کە هێشـــتا بە سەر کارەکەیا زاڵ نییە و ناتوانێت لەشـــە قورسەکەی لەو شێوازەدا ڕابگرێ. تۆزێک نەزانانە خۆی بۆ ڕاگیرابـــوو و لە ناو حەوشـــەکەدا وردە وردە هەنگاوی دەنا. دوای ماوەیەک هەر بەراز بوو لە سەر دوو پێ دەڕۆیشت و لە ماڵەکە دەهاتە دەر و بە دوای سـکوئیلەردا ڕیزەڵەیان دەبەست. هێندێکیان لە ئەوانیتر باشتر بوون. یەک دوو دانەیان نەیاندەتوانی خۆ ڕاگرن. وەک ئەوەی وابوو کە پێویســـتیان بە گۆچان هەیە. بەڵام هەموو بەســـەرکەوتووانە بە چوار قوڕنەی حەوشەکەدا گەڕان.

دواتر حەوتەحەوتی ســـەگەکان و دەنگی زیقی کەڵەشـــێرە بچووکەکە بـــەرز بووەوە و ناپلیۆن بە شـــکۆوە لە کاتێکدا کە ســـەگەکان بە دەوریدا بازبازێنیان بوو ئەویش بە فیزەوە ســـەیری ڕاســـت و چەپی خۆی دەکرد، دەرکەوت. قامچیەکی بە دەســـتەوە بـــوو. بێدەنگییەکی مەرگاوی هەموو شـــوێنێکی داگرت. ئاژەڵەکان بە تـــرس و سەرســـووڕمانەوە دەیانڕوانییە زنجیـــرەی بەرازەکان. دەتگوت ژیان کۆتایی پێهاتـــووە. کاتی ئەوە بوو کە ئاژەڵەکان ســـەرەڕای ترس لە ســـەگەکان ئەو بێدەنگییەی کە زۆر لەمێژ بـــوو پێی ڕاهاتبوون، بشـــکێنن و دەنگی نارەزایەتی بـــەرز بکەنەوە، بەڵام لە پـــڕ هەموو مـــەڕەکان یەکدەنگ بارەباری «چوار پـــێ باش و دوو پێ باشـــتر، چوار پی باش و دوو پێ باشتر»یان دەست پێکرد. ئەم بارەبارە نیو خولەکی تەواوی خایاند و کاتێک بێدەنگ بوون چیتر مەجالی نارەزایەتی دەربڕینیان نەهێشتبووەوە. بەرازەکان گەڕابوونەوە بۆ ناو خانووبەرەکە.

بنجامین هەســـتی کرد لمبۆزێک لە شـــانی خشکا. سەری وەرسوڕاند، کلوور بوو. چاوەکانی لە پێشـــتریش کزتر ببوون. بێ ئەوەی وشەیەک بڵێ یاڵەکانی بنجامینی ڕاکێشـــا و ئەوی لەگەڵ خۆی برد بۆ دواوەی تەویلەکە.

ئەو شـــوێنەی کە حەوت فەرمانەکەی لێ نووســـرابوو. یەک دوو خولەک لەوێ وەستا و سەیری نووسراوە سپی ڕەنگەکەی سەر دیوارەکەی کرد.

دواجـــار کلوور هاتە قســـە و گوتی: «چاوەکانم کز بـــوون، تەنانەت ئەو کاتەش کە گەنج بووم نەمدەتوانی نووسراوەکان بخوێنمەوە، بەڵام وام دێتە بەر چاو کە نووســـراوەکانی ســـەر دیوارەکە بە جۆرێک گۆڕاون. بنجامین پێم بڵێ بزانم، حەوت فەرمانەکە وەک پێشـــوون؟» بنجامین بۆ یەک جار لە ژیانیدا لە یاســـاکەی تێپەڕی و بە دەنگی بەرز ئەو شـــتەی خوێندەوە کە بە ســـەر دیوارەکەوە نووسرابوو. لە سەر دیوارەکە لە یەک فەرمان زیاتر شتێکیتر نەبوو.

«هەموو ئاژەڵەکان یەکسانن، بەڵام هەندێک یەکسانترن!»

لە دوای ئـــەم ڕووداوە چیتر بە لای ئاژەڵەکانەوە ســـەیر نەبوو کاتێک کـــە بینیشـــیان بەرازەکان ڕادیۆیـــان کڕیوە و تەلەفون بـــەکار دەهێنن و ڕۆژنامە دەخوێننەوە. چیتر کاتێـــک ناپلیۆنیان دەدی کە هەنگاو دەنێت و سەبیلەیەکی بە دەمەوەیە، سەرسووڕماو نەدەبوون. کاتێکیش کە بەرازەکان جل و بەرگی ئاغای جۆنزیان لە قەفەسەکان دەرهێنا و لە بەریان کردن و ناپلیۆن کۆتی ڕەش و چەکمەی چەرمی پۆشی و بەرازە مێیینە نازدارەکەی جل و بەرگی خانمی جۆنزی لە بەر کرد، واقیان وڕ نەما.

پاش حەفتەیەک، چەند گالیســـکەی یەک ئەسپە هاتنە ناو مەزراکەوە. لیژنەیـــەک لە جووتیار و خاوەن موڵکەکانی دراوســـێ بۆ بینینی مەزراکە داوەت بـــوون. هەموو کون و قوژبنێکی مەزراکەیان پێ نیشـــاندان. ئەوان هەموو شـــتێک و هەموو شـــوێنێکیان بەلاوە خۆش و باش بوو. بە تایبەت ئاشەکە سەرنجیانی زۆر ڕاکێشا. ئاژەڵەکان بە وردی خەریکی بژار و ناوکۆڵی زەوی شێلمەکە بوون. تەنانەت سەریان بەرز نەدەکردەوە و نەیاندەزانی کە

لە بەرازەکان زیاتر دەترسن یان لە مرۆڤەکان.

ئەو شـــەوە دەنگی پێکەنین و گۆرانی لە ناو خانووەکەوە دەبیســـترا. لە ناکاو دەنگ و هەراکان ســـەرنجی ئاژەڵەکانی ڕاکێشا. دەیانویست بزانن لەو شـــوێنەدا کە بۆ یەکـــەم جار مرۆڤ و ئاژەڵ لە بار و دۆخێکی یەکســـاندا پێکـــەوەن، چی ڕوو ئەدا. هەموو بـــە مارەخزە و بە بێدەنگ بەرەو باخەکە ڕۆیشتن. لە بەر دەرگاکەدا هەموو بە ترسەوە وەستان. بەڵام کلوور پێشیان کەوت و ئاژەڵەکان بە هێواشـــی بە دوایدا ڕۆیشـــتن و ئەوانەی کە باڵایان بەرز بوو لە پەنجەرەکەوە ســـەیری ناو هۆڵەکەیان دەکرد. لەوێ بە دەوری مێزێکی درێژدا شەش مرۆڤ و شەش بەرازی پایەبەرز دانیشتبوون. ناپلیۆن لە ســـەرەوەی مێزەکە دانیشتبوو. وا دەهاتە بەر چاو کە بەرازەکان زۆر بێ کێشە لە ســـەر کورسیەکان دانیشـــتوون. دیار بوو خەریکی یاری پاسوور بوون و جارێ بۆ ماوەیەکی کورت دەستیان لە یاری کێشابووەوە، تا پێکێک بخۆنـــەوە. گۆزەیەکی گەورەیان گێڕا و پیاڵەکان پـــڕ کرانەوە لە ئاوی جۆ. کەس ئاگاداری ئەو ئاژەڵە ترساو و ڕەنگ پەڕیوانەی پشت پەنجەرەکە نەبوو.

ئاغای پیل کینگتن، خاوەنی فاکس وود، پیاڵە بەدەست هەستا و گوتی پێش ئەوەی پێکەکانتان هەڵدەن، لە ســـەرمە چەند وشـــەیەکتان ئاراستە بکەم. گوتی، بۆ ئەو و بە دڵنیاییەوە بۆ هەموو ئەو کەســـانەی کە شەرەفی بەشـــداری کردن لەم کۆبوونەوەیان پێدراوە، جێی ئەوپەڕی خۆشـــحاڵی و شانازییە کە دەبینن ئەو ماوە درێژە پڕ لە دڕدۆنگی و بێ متمانەیی بەسەر چووە. وەختێک بوو کە ئەو و بەشـــدار بووان و تەنانەت کەســـانی تریش، هەرچەند دەتوانین بڵێین نەک بەچاوی دوژمنایەتییەوە، بەڵکوو بە چاوێکی دڕدۆنگانـــەوە دەیانڕوانییە خاوەنە بەڕێزەکانی قەڵای ئاژەڵان. کارەســـاتی دڵتەزێن قەومان. بیر و بۆچوونی هەڵە دروســـت بـــوون. وا بیر دەکرایەوە

کە بوونی مەزرایەک بەخاوەندارییەتی بەرازەکان و ئاژەڵەکانیتر نائاسساییە و لەوانەیە ببێتە هۆی نائارامی لە مەزراکانی دراوسسێدا. زۆربەی جووتیاران بێ پرس و لێکۆڵینەوە وایان دەزانی کە لە وەها مەزرایەکدا ڕۆحی هەرچی و پەرچییەتی فەرماندەر دەبێ. لە بابەت کاریگەری لە سەر ئاژەڵەکان و تەنانەت کرێکارەکان، شڵەژاو و نیگەران بوون. بەڵام هەموو ئەم بیر و بۆچوونە هەڵانە ئێستا لە ناو چوون. ئەمڕۆ ئەو و هەموو ئەو دۆستانە بست بە بستی قەڵاکەیان بینی و بە چاوی خۆیان بینیان کە نە تەنیا ئامێری ئەمڕۆیی، بەڵکوو زۆر کار و پڕۆسەی جوانی لێ هەن کە بۆ هەمووان جێی سەرنجە.

ئەو بە دڵنیایی تەواوەوە توانی بڵێ کە ئاژەڵەکانی ئەم قەڵایە زیاتر لە ئاژەڵانی شوێنەکانیتر کار دەکەن و کەمتریش دەخۆن. لە ڕاستیدا ئەو و ئەم دۆستانەی کە ئەمڕۆ لەم مەزرایە چاوپێکەوتنیان هەبووە، دەیانهەوێ کە شێوەی کاری ئەوان لە زۆر بابەتەوە لە مەزراکانی خۆیان بەکار بهێنن.

لە درێژەی قسەکانیدا گوتی؛ بە پێداگرتن لە سەر ئەو هەستە دۆستانەی کە لە نێوان قەڵای ئاژەڵان و دراوسێکاندا هەیە و دەبێ درێژەشی هەبێ، کۆتایی بە قسەکانی دێنێ. لە نێوان بەراز و مرۆڤدا هیچ کات کێشە نەبووە و هۆکارێکیش نابینێ کە لەمە بەدواش هەبێت. کێشە و کۆسپی ئەوان هەموو یەک جۆرە. مەگەر کێشەی کرێکارەکان لە هەموو شوێنێک یەکسان نییە؟ دیاربوو ئاغای پیل کینگتن دەیویست نوکتەیەک بڵێ کە پێشتر ئامادەی کردبوو. ماوەیەک بۆ خۆی بە جۆرێک لەو نوکتەیە کە نیازی گێڕانەوەی هەبوو سەر نەشە کەوتبوو کە نەیتوانی بیگێڕێتەوە.

دوای ئەوەی چەند جاران هەناسەی وەستا و سوور هەڵگەڕا و بناگوێی سوور و بۆر بوون، گوتی: «ئەگەر ئێوە کێشەی ئاژەڵی پلەی خوارەوەتان

هەیە، بۆ ئێمەش خەڵکی پلە نزم کۆسپەا!» بە بیستنی ئەم نوکتەیە هەموو دایان لە قاقای پێکەنین. ئاغای پیل کینگتن جارێکیتریش لە بابەتی کەمی خـۆراک و درێژ بوونـــی ماوەی ئیش و بەتاڵپـا بارنەهێنانی ئاژەڵەکان لە قەڵاکەدا، پیرۆزبایی لە بەرازەکان کرد.

لە کۆتاییشـــدا گوتی: «ئێستا داواتان لێدەکەم هەستن و پێکەکانتان پڕ بکەن و هەموو بە خۆشـــی پێشکەوتوویی قەڵای ئاژەڵان بیخۆنەوە!» هەموو هووڕایان کێشا و دەستیان کرد بە پێکوتان و سەما.

ناپلیۆن بە قســـەکانی پیل کینگتن بە جۆرێک ســـەر نەشە کەوت کە هەســـتا و پێش خواردنەوە پێکەکەی لە پێکی دا. کاتێک دەنگی هووڕاکان نزم بوونەوە، ناپلیۆن کە هێشـــتا بە پێوە بـــوو ڕایگەیاند کە ئەویش چەند وشـــەیەکی بۆ گوتن هەیە. وەکوو جارانی پێشـــوو ئەمجارەش کورت و بە کەڵک قســـەی کرد. گوتی ئەویش بە نۆبەی خۆی لە بەســـەر چوونی ئەو ســـاتە بێ متمانەییانە شادمانە. ماوەیەکی درێژ پڕوپاگەندەیەک لە ناودا بوو کە گۆیـــا ئەو و هاوڕێکانی نیازی خرابـــکاری و تەنانەت ڕاپەڕینیان هەیە. دیارە کە ئەم پڕوپاگەندانەش لە لایەن دوژمنە ناحەزەکانیانەوە کە هاندانی ئاژەڵانی مەزرای دراوســـێکان بۆ ڕاپەڕین بـــە قازانجی خۆیان دەزانن، بڵاو بوونەتەوە.

تەنیـــا ئاواتـــی ئەو، چ ئیســـتا و چ لە ڕابردوودا ئەمە بـــووە کە لەگەڵ دراوســـێکان لە خۆشی و ئاشتیدا بژین و لەگەڵ ئەوان لە بواری کەسابەتدا پێوەندیان هەبێ.

هەر وەها ئەم مەزرایەش کە ئەو شەرەفی ئیدارە کردنی هەیە مەزرایەکی فرە بەشییە کە بەڵگەی خاوەنداریەتییەکەی بە ناوی هەموو بەرازەکانەوەیە. لە پاشـــاندا ئەوەشـــی گوت کە هەر چەند کە گومانی لەوەدا نییە کە بێ

متمانەیی و دڕدۆنگی پێشـــووی نێوانیان تەواو بووە، بەڵام بۆ دەرخســـتنی دڵپاکیمان لە حاست مرۆڤەکانی دراوسێ، لەم دواییانەدا لە شێوازی بەڕێوە بردنـــی مەزراکە گۆڕانکاریمان ئەنجـــام داوە. وەکوو ئەم نموونەیە کە تا ئەم ڕێکەوتە ئاژەڵەکانی ناو مەزراکە خوویەکی گەمژانەیان هەبوو کە یەکتریان بە هاوڕێ ناو دەبرد، بەڵام لەم کارە بەرگری کراوە. جا لەم خووە ســـەیرتر هەبوو کە بنەماکەی نادیارە! بەیانی هەموو یەکشـــەممەیەک ئاژەڵەکان لە بەردەم کاسەسەری بەرازێکی نێر کە لە سەر تیرەکێک دانرابوو، بە ڕێزەوە ڕۆیشتنی ســـەربازیان ئەنجام دەدا. لەم کارەش ڕێگری دەکرێ و ئێستاش ئەو کاســـە ســـەرە ژێر گڵ خراوە. بۆی هەیە میوانەکان ئەو ئاڵا سەوزەیان دیبێت کە لەســـەر دارێک هەڵدرابوو، پێم وابێ سەرنجتان دابێ کە سم و شاخێکی سپی کە پێشتر لە سەری کێشرابووەوە، ئێستا نەماوە و ئاڵاکە لەم کاتە بە دواوە تەنیا بە ڕەنگی سەوز دەبێت. گوتی لە سەر وتە دۆستانەکەی ئاغـــای پیل کینگتن، ڕەخنەیەکم هەیە و ئەویـــش ئەمەیە کە ئەو بەڕێزە قەڵاکـــەی بە قەڵای ئاژەڵان نـــاو برد. هەڵبەتە نەیدەزانـــی، ئاخر ئەمە بۆ یەکەمجارە کە ڕادەگەیەنرێت کە ناوی قەڵای ئاژەڵان کوێر بووەتەوە و لەمە بەدواوە بە مەزرای مانێر کە پێم وابێ ناوی ڕاســـتەقینەی شـــوێنەکەیە ناو دەبرێت. لە کۆتاییـــدا ناپلیۆن گوتی، بەڕێزان پێکەکانتان پڕ بکەن. منیش وەک ئاغای پیل کینگتن داوا لە بەشـــدار بووان دەکەم کە پێکەکانیان بە هیوای پێشکەوتنی مەزراکەمان بخۆنەوە.

بەم جیاوازییەوە کە دەڵێم بەڕێزان بە هیوای پێشکەوتنی مەزرای مانێر بخۆنەوە!

ئەمجارەش وەک جاری پێشـــوو هەموو هووڕایان کێشـــا و پێکەکانیان تـــا دوا چۆڕ خـــواردەوە. بەڕای ئەو ئاژەڵانەی کە لە دوورەوە ســـەیری ئەم

دیمەنەیـــان دەکرد، شـــتێکی تـــازە ڕووی داوە. لە ڕواڵەتـــی بەرازەکان چ گۆڕانکارییەک بەدی دەکرا؟

کلوور بە چاوە کزەکانی لەم ڕوخســـارەوە بۆ ئەو ڕوخسار ورد دەبووەوە. هەندێکیان پێنج غەبغەبیان هەبوو، هەندێک چوار، هەندێک سێ. بەڵام شتێک کە لە تووانەوە و گۆڕاندا بوو چی بوو؟

دوای ئـــەوە کە چەپڵە لێدان و هووڕا کێشـــان تەواو بـــوو، پەڕەکانیان هەڵگرت و دەستیان کردەوە بە یاری و ئاژەڵەکانیش دانەدانە و بە بێدەنگی دوور کەوتنـــەوە. چەند هەنگاوێکیان هەڵ نەگرتبوو کە ڕاوەســـتان. هەراو هۆریایەک لە ماڵەکە بەرز بووەوە. بە پەلە گەڕانەوە و دیســـان لە دەلاقەی پەنجەرەکەوە سەیریان کرد. دەمە قاڵەیەکی قورس بوو.

هاواریان دەکرد و مســـتیان لەســـەر مێزەکە دەدا. بە خێسەوە سەیری یەکتریان دەکرد و قسەی یەکیان بە درۆ دەخستەوە. دیار بوو سەر چاوەی قڕەکـــە ئەمە بوو کە ناپلیۆن و پیـــل کینگتن هەر دووکیان لە یەک کاتدا ئاســـی پیکیان ڕوو خســـتبوو. دوازدە دەنگی تووڕە لە کتوپڕ بەرز دەبووەوە. ئیتر ئەوەی کە چ شتێک لە ڕواڵەتی بەرازەکاندا گۆڕاوە لە ئارادا نەبوو.

ئاژەڵەکانـــی دەرەوە، لە بەرازەوە بۆ مرۆڤ و لە مرۆڤەوە بۆ بەراز چاویان دەگواستەوە، بەڵام چیتر نەیان دەتوانی لێکیان بکەنەوە.

